

هەمیشە دەستمان بە باوەڕی برایەتی هەردوو نەتەوەوە گرتووە لەسەر خاکی عیراق و تائێستا ئەمە ئەو باوەڕەمانە کە سوورین لە سەری بە قسەو کردەوەو لە سیستەمی حوکمی زاتیدارایی دەکەین.

سەرۆکی فەرماندە
صدام حسين




# رۆشنبیری نوێ

گۆڤارێکی وەرزی لێکۆڵینەوەیە
دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات


## لەم ژمارەیەدا



# بەبۆنەی یادی بیست و شەشەمینی دەرچوونی بەیاننامەی یانزەی ئازاری مێژووییەوە

## ڕەچەڵەک و ئاسۆی بەیاننامەکە


د. ماجد عبدالرضا
ئەندامی ئەنجومەنی ئاشتی و دۆستایەتی و هاوکاریی عیراق


لە سەرەتای ساڵانی یەکەمی چەرخی بیستەمەوە بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد، بەشێوەیەکی ڕوون ئاشکرا و لەسەر ڕەگ و ڕیشەی پەیدابوون و ئەشونماکردنی پەیوەندییەکانی سەرمایەداری نێو کۆمەڵگای کوردەواری پەرەی سەند و هاتەکایەوە، کە ئەویش بەهۆی سەرەتای هەڵدانی ئابووری سەرمایەدارییەوە بوو. لەجەستەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا کەلەو کاتەدا بەشێکی زۆری کوردوستان لەژێر باری دەسەڵاتدارێتی ئەودا بوون.

بزووتنەوەی نەتەوایەتی گەلی کورد بەو جۆرە ئاڵوگۆڕکارییە کۆمەڵایەتییانەوە خۆی بەستەوە و گەشەوونەش و نمای کرد، ئەگەرچیش، خەباتی دژ دەسەڵاتداریتی بێگانە و ڕووەتوتێنەرەکانی چەوساندنەوە و دەرەبەگە کوردەکان پەک خرا لەوەدەرەبەگانەی کە لە زۆر کاتدا هاریکاریان دەگەڵ دوژمنانی گەلی کورد دەکرد. بەڵام ئەمە ئەو ڕاستییە ناشارێتەوە کە چەند سەرۆک خێڵ و دەرەبەگ و پیاوانی ئاینی سەرکردایەتی بزووتنەوە و جموجوڵی نەتەوایەتی کوردیان کردووە.

بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد بەوانا هاوچەرخەکەیەوە، هاوشانی بزووتنەوەی بۆرژوای تورک بوو، کە لە ساڵی ١٩٠٨ دا لەناوجەرگەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە بەرپابوو. هەروەک لەهەمان کاتدا بزووتنەوەی ئازادیخوازی ڕووسیا کاریگەری باڵای هەبوو بەسەر بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردەوە، ئەگەرچیش بزووتنەوەی ئازادیخوازی تورکیا و ئێرانیش، جێگای دیاریکراوی خۆیان بەسەر باری بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردەوە هەیە.

دوابەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە گەلی کورد، هەروەک گەلی عەرەبی هاوسێ و برای لە ئاینی ئیسلامی پیرۆزدا، تووشی بەش بەش کردن و دەسەڵاتدارێتی ئیستعمار بوو. ئەوەتا چەند ئیمپراتۆریەتی شوێنی دەسەڵاتدارێتی خۆیان لەجەستەی ڕماوی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا دەست نیشان کرد و کوردوستان وگەلەکەی لە نێوان سێ دەوڵەتی خاوەن قەوارە و سنووری تایبەتیدا دابەش کرا، هەر بۆیە بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردیش بوو بە سێ بەشەوە، بەهەمان جۆریش گەلی عەرەب و بزووتنەوەی نەتەوایەتی عەرەب تووشی هەمان گێرمەوکێشە بوو، بڕیارەکانی کۆنگرەی ئاشت بوونەوەی فەرسای ڕەنگدانەوەی یاسایی ئەو کارە ناهەموارەی ئیستعمار بوو.

سەبارەت بەنیشتمانەکەمانەوە، عیراق، کوردی عیراق بارێکی مەوزووعی نوێی تایبەتی لێ هاتەکایەوە، کە دەبێ بەتەواوەتی بخرێتە پێش چاو. ئەم بارەش بەتایبەتی پاش وەرگرتنی عیراق لە (عصبة الامم)دا لە ١٩٣٢/١١/٣دا ئاشکرابوو.

ڕێڕەوی بزووتنەوەی گەلی کورد لە عیراقدا لە ژێر سایەی سێبەری بارێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی، ڕامیاری گشتی دەوڵەتی عیراقی وەسەر بەستەدا قەبارە و بوونێتی خۆی دەست نیشان کرد و بەشێک لەگەلی عەرەب و کورد بە چوارچێوەی عیراقەوە بەند بوون، هەر لەو کاتەشەوە

ناك ڕەوی و تەنهایی و سەربەخۆیی پەرەپیدان کێشەی کورد لە عێراقدا کۆتایی پێهاتو بووە بەشێك لە سەرانسەری کێشەی عێراق و کێشە سەربەخۆیی نیشتمانی و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و ڕێبازی سەرتاپای عێراق . .

لەسەر بناغەی ئەوەی لەسەرەوە باسمان کرد، بەپێویستی دەزانین کە دەبێ بەتەواوەتی لە باری ڕامیاری ڕژێمی پادشایەتی بگەین کە بێگومان ئیستعمار لەساڵی ١٩٢١دا لەعێراقدا ڕایی کردو چەسپاندی، بەواتایەکی ڕوونتر، دەتوانین بڵێین ئەو ڕژێمە چی بەڕۆڵەکانی گەلی کورد لەعێراقدا پێشکەش کردو هێنایەدی و لە چ ڕوانگەیەکەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کێشەی کوردی عێراقدا دەکرد؟ ئەم پرسیارە دێرینە، هێشتا بەگرنگی خۆیەوە ماوەتەوەو تەنانەت وتوویژو لێکۆڵینەوەی ئەو بارەش تا ئەمڕۆژی ئیمڕۆشمان هێشتا گەرمو گوڕو چێژی تایبەتی خۆی هەیە ئەوەش لەهەر بارێکەوە بێ ئایا بە تایبەتی یە کوردی یەکەیەوە بێ یاخود دەربارەی سەرانسەری سیاسەتی ئیستعمارەوە بێت لە ماوەی حوکمرانێتی پادشایەتی لە

عێراقدا . ئەو ڕژێمە پادشایەتی یە کە ئیستعمار لەعێراقدا دایکوتاو چەسپاندی چ جۆرە سیاسەتێکی نیشتمان پەروەری سەربەخۆی بەرامبەر بەگشت گەلی عێراق، بە عەرەب و کوردی یەوە نەگرتە خۆی و هەمیشە لە ڕاوێژکاری و بەڕێوەبردن سیاسەتی ئیستعمارەوە کار و کرداری ئەو ڕژێمە هەڵدەقولا، بەلام ئەو ڕاستی یەش ناکرێت بەژێر لێوەوە کە بەهۆی ڕژێمەوە چەند کەسانێکی کورد چەند شوێنێکی بەڕێوەبەرایەتی و ئاسلو باڵایان گرتبووە دەست، وەك وەزیر و گەورە پیاوان سەربازی و لایەنەکانی تری دەوڵەت، کە لەمانیش بەشێك بوون لەباری گشتی و دەوڵەتی دواکەوتنخوازی پادشایەتی بەگوێرەی بەرژەوەندی ئیستعمار ڕەوتیان دەکرد ئەو ئیستعمارەی کە باڵی ڕەشی بەسەر سەرانسەری عێراقدا کێشابوو. ئەم هەنگاوەش لە سەرەتاوە ئاشکرا بوو، وەبەتایبەتی لەکۆنگرەی قاهیرەدا کە بەریتانیا بەسەرکردایەتی تشرشل لە ٢٢ ئازاری ١٩٢١دا سازی کردو لەبڕیارەکانی دا ئاماژەی بۆ مافی گەلی کورد کرد بەمەرجێ لەچوارچێوەی دەوڵەتی عێراقدا بێت هەر لەوکاتەشدا بڕیاری دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق درا، بەواتایەکی تر لەو کۆنگرەیە لەباری ناوچە کوردی یەکان و پەیوەندی یەکان بەعێراقەوە دراوە. لەماوەیەکی دواتردا بەجۆرێك کێشەی کورد بەکار دەهێنا کە دەسەڵاتداریتی بەریتانیا بەسەر عێراقدا پتەوبکاتو بچەسپێنێ و بتوانێ سامانە نەوتی و سامانەکانی تری عێراق بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاربهێنێ شان بەشانی سیاسەتی داپڵۆسینی خوێناوی و بەرەنگاربوونەوەی گەلی عێراق بە نوێ ترین چەکی ئەو سەردەمە هەروەك بەرەنگاربوونەوەی ڕاپەڕینە نیشتمانی یەکەی شێخ مەحمودی حەفید لە ٢١ ئایاری ١٩١٩دا بەلام ئەم داپڵۆسینە خوێناوی یانە ڕێگایان لەوە نەدەگرت بیر و باوەری ئازادی خوازی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ و هەڵوێستەکانی دەسەڵاتداریتی سۆڤیەت بڵاوبێتەوە کە

ڕێکەوتن نامەی ... ئاشکرا کرد، لەم بارەیەوە ئەنجەرلی بی سون سەر بە بەریتانیا نارەزایی خۆی سەبارەت بە شاری سلێمانی دەردەبڕی کاتێك دەنووسێ (بەداخەوە لەبەدبەختی ئێمەوە بەناوی بەلشفی و هەندێ لەواتاکانی لەم شارەدا شتێکی ناسراوو ئاساییە) . . .

هەروەها مامۆستا صلاح الدین محمد سعد الله لە پەراوی «کوردوستان و بزوتنەوەی کوردەکانی عێراق»دا دەڵێت لە نێو هەموو قۆناغەکانی سیاسەتی بەریتانیا بەرامبەر بەعێراق، قۆناغەکانی داگیرکردنو دەستبەسەرو چاودێری کردنو سەربەخۆیی مەرجداری یەوە کە ئەمووری بە مەبەستی دەست بەسەرداگرتنی سامانەکانی عێراق و گەلەکەیەوەبوو بەکوردو عەرەبی یەوەو بەرەنگاربوونەوەی بزوتنەوە بەرهەڵستکاری یەکان بەچەکو سیاسەتی داپڵۆسین. ئەمەو سەرەڕای ڕێبازی هەڵەپێکردنو ساختەبازی و خەڵەتاندن، بەلام ئەوەی کە سەبارەت بە چینو توێژە دواکەوتنخوازەکانی کوردو عەرەبەوە بووتری ئەوەیە کە بەیەك ڕادە بوونە پێشخەر و دامەزرێنەری بنەڕەتی کۆمەڵایەتی ڕژێمی پادشایەتی کە بەریتانیا بەرپای کردو دایمەزران . . لێرەشدا شتێکی زانیاری و واقیعی نیە، گەر بڵێین سیاسەتی دواخستن و دواکەوتن خوازی عێراق تەنها بەرامبەر بە مافی نەتەوایەتی و سیاسی و کۆمەڵایەتی کورد نەبووە، بەلام لەپاش ڕماندنی ڕژێمی پادشایەتی و داین کردن ڕژێمی کۆماری لە ١٤ تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ دا مافی نەتەوایەتی هاتەدی ئەگەرچی ڕووداوەکان دابەش کردنو لێك جیابوونەوەو بەرەنگاربوونەوەی چەکداری و هەڵەکانی ئەوکاتەو ئەنجامە سلبی یە گەورەکانی ناوەرۆکی ئەم ڕاستی یە ناگۆڕن .

یەکەم هەڵوێستی دەسەڵاتداریتی کۆماری عێراق کە لە ١٤ ی تەمووزی ١٩٥٨دا بەرپاکرا، بەرامبەر بە کێشەی نەتەوایەتی کورد لە ماددەی سێهەمی دەستووری کاتی وڵاتدا تۆمار کرا کە دەڵێ «ئەوارەی عێراق لەسەر بنکەی هاریکاری نێوان هەموو هاونیشتمانیانو ڕێز گرتن لە مافەکانیانو پاراستنی ئازادی و سەربەستی یان، کە عەرەبو کورد هاوبەشن لەم وڵاتەداو یاسا دان بەمافی نەتەوایەتی یاندا لەچوارچێوەی یەکێتی عێراقدا دەنێ . .» بێ گومان ئەمەش گۆڕانکاری یەکی نەوعی بوو لە هەڵوێستی ڕژێمی سیاسی وڵات سەبارەت بەکێشەی نەتەوایەتی کورد، ئەمەش بۆ یەکەم جار لەمێژووی دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقی هاوچەرخدا ڕوو دەدات.
بەلام لەو قۆناغەدا ئەو برگەیە لەلایەن یاسایی یەوە نەهاتەدی و شێوەو ناوەڕۆکی مافی نەتەوایەتی کورد لەعێراقدا بەتەواوەتی نەخرایە ژێر باری کردارەوە ئەگەرچی ڕژێمی کۆماری ئەوسا چەند هەنگاوێکی پێشکەوتن خوازانەی بەرەو لایەنەکانی فێرکردنو ڕۆشنبیری و باری ژیانی سیاسی یەوە ناو ڕێگای بە دەرچوونی ڕۆژنامە کوردی یەکان داو زمانی کوردی بەزمانێکی سەرەکی خوێندنو هەڵسوکەوتی ڕەسمی لە کوردستاندا دانا و بەڕێوەبەرایەتی مەعارفی کوردی دامەزراندو چەند دەزگا و دامەزراوی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی کوردی هێنایە کایەوەو لەمانەو سەرەڕای بوونی

ئەندامێکی کورد لە بەرزترین پلەی دەسەڵاتداریی یاساداناندا لە عیراقدا کە ئەوکاتە (ئەنجومەنی سیادە) بوو، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا چەکەرەی ناکۆکی و ناکۆکی و ناتەواوی کەوتە نێوان دەسەڵاتداریی میری و بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردەوەو، بەرە بەرە بەرەو توندو تیژتر دەڕۆیشت و زیاتر گیرەوکێشەی دەهاتە بەر تا لە ئەنجامدا گەیشتە رادەی بەیەکدادانی چەکداری لە نێوان هەردوو لایەنی میری و بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورددا، لە ساڵانی دواتردا چەند ماوەیەکی جیاوازی هێمن و دامرکاندنو سەرلەنوێ بەیەکدادانی چەکداری لە نێوان میری و بزووتنەوەی چەکداری کورددا رچاو دەکەین و چەند بوارێکی ئاشتی لە نێوان هەردوو لایەندا بەدی دەکەین و داواکارییەکان هەردوو لایەنی زۆرانبازی لە قۆناغێکەوە بۆ ئەوی تریان بەرەی دەستانەو برلراوانی دەبوو، یاخود پاشگەز دەبوو و لەوێش بەگوێرەی بەرەوپێدانی هەڵوێستی رامیاری گشتی هەردوو لایەنی هاوکێشەی زۆرانبازی و پەیوەندییە گشتییەکانەوە. بۆ نموونەش ئەو پڕۆژەیەی میری کە لە ١٥ ی ئازاری ١٩٦٣دا بەناوی (لامەرکەزی) یەوە بڵاوی کردەوە کورتەکەی بریتی بوو لە دابەش کردنی عیراق بەسەر شەش ناوچەی سەرەکیدا ئەوانیش مووسڵ و کەرکووک و سلێمانی و بەغداو حللەو بەسرا بوون کوردستانیش لە یەکێ لەم ناوچانەدا دێت کە مەڵبەندەکەی سلێمانی بێ ئەمەش لەلایەنی کوردەوە بە دابڕاندنی بەشێکی زۆری کوردستان دانرا هەربۆیە بزووتنەوەی چەکداری نەتەوایەتی کورد بڕیاری لەسەر نەبوو لە هەمان کاتیشدا پڕۆژەیەکی تری خستە پێش چاو حکومەتی عیراق کە تیایدا ئامانجی گەلی کوردی خستە ڕوو لە داهێنانی حوکمی زاتی لە کوردستاندا بەمەرجێک بەندبێ بە چوارچێوەی کۆماری یەکگرتووی عیراقەوە بەڵام لەلایەن حکومەتەوە پەرمونەکراو باری کێشەکە گەلێک ئاڵۆزتر بوو لە کۆتاییدا جەنگێکی چەکداری نوێ لە نێو میری و بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورددا بەرپابۆوە. ئەم باری جۆراوجۆرو دژوارییە بۆ چەند جارێکی تر لە نێوان ساڵانی لەوەو پاشتردا رچاو دەکرێت هەر لەمەش بوو کە بەشێوەیەکی راستەوخۆ هێزەکانی دوژمن و ئیستعمار دەستیان لەو کێشەیەدا بخەنە کار هەر بەو هۆیەشەوە بوو، ئیلەی یەکەم جەنگ بڵێەی سەند و یەکەم جەنگ لە ئەیلوولی ١٩٦١دا بەرپابوو تا شوباتی ساڵی ١٩٦٣ بەردەوام بوو ئەنجا هۆیەکی سەرەکیش بوو لە بەرپابوونی ماوەکانی تری جەنگ کە دووهەم جاری لە ١٠ حوزەیرانی ١٩٦٣وە تا . شوباتی ١٩٦٤ی خایاند و لە پاشان لە ٤ ئازاری ١٩٦٥وە بۆ حوزەیرانی ١٩٦٥ و بۆ چوارەم جار لە ٤ نیسانی ١٩٦٩وە بۆ ئازاری ١٩٧٠ و بەرەو جەنگی پێنجەم لە ئازاری ١٩٧٤وە تا ئازاری ١٩٧٥ و بۆ ئاخری جار لە ئایاری ١٩٧٦وەو تائێستا ژیلەمۆی نەکوژاوەتەوەو بەردەوامە.

لە ساڵی ١٩٦٤ دا مەلا مستەفای بارزان پڕۆژەیەکی خستەڕوو کە بەگوێرەی ئەو پڕۆژەیە حوکمی زاتی لە چوارچێوەی کۆماری یاسایی و دیموکراتی عیراقدا خستە ڕوو وەک ئاتی کردنەوەی ئەو دەوڵەتانەی پێش لە ئەنجومەنیەکی تیادا گوزەران دەکات وەک یوگوسلاڤیاو سویسراو یەکێتی وڵاتەکانی سۆڤیەت و تشیکۆسلۆڤاکیاو کەنەداو هیندستان . . . کە لەم دەوڵەتانەدا کێشەی گیروگرفتی چەندێتی نەتەوایەتی بەپێی یەکسانی نێوانیان چارەسەر کراوە.

لە ١٠ ای شوباتی ١٩٦٤دا رێک کەوتنێک لە نێوان میری و مستەفا بارزانیدا راگەیەنراو میری لەوەی ئاشکرا کرد کە مافدانی نەتەوایەتی کورد لە چوارچێوەی کۆماری عیراقدایە بەڵام جۆرو چۆنێتی ئەو مافانەی بەشێوەیەکی راستەوڕەوان ئاشکرا نەکردو نەیخستە ژێر باری جێبەجێ کردنەوەوە و لە ئەنجامیشدا لە چەندین لەرکی سەرشان پاشگەز بۆوە، لەوەبوو لە ٤ی ئایاری ١٩٦٤ دا دەستووری نوێی وڵات ئاشکرا کرا کە تیایدا چاوپۆشییەکی تەواو لە مافە نەتەوایەتییەکانی کورد کرابوو لەمەش بووە هۆی ئەوەی سەرلەنوێ ناکۆکی بکەوێتە نێوان حکومەت و بزووتنەوەی کورد . لە هەمان کاتیشدا ئاڵۆزی نێوان لایەنەکانی میری گەیشتە پلەیەکی سەخت و لە ئەنجامدا حکومەتی عبدالرحمن بەزاز پێک هات و بەیاننامەی ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦ی دەرکرد و ج داواکارییەکی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردی کە لەو قۆناغەدا بریتی بوو لە حوکمی زاتی و ئەنجامەکانی نەگرتبووە خۆی.

لە ماوەی ساڵانی رابووردوودا کە باسی باری هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ کێشەی گەلی کوردی عیراق دەکرێت چەند لایەنێکی نوێی بەتین و پڕ مەترسی دێتە گۆڕێوە کە خۆی لە بایەخپێدانی هێزەکانی ئیمپریالیزمەوە بەتایبەتی لە ئەمەریکا دەنوێنێ لە تەک ئەوەشدا، بایەخ پێدانی دەزگاو بەڕێوەبەرایەتییە زایۆنییەکان بەو کێشەیە لە ڕوانگەو ستراتیژیەتی ئەو دەزگایانەوە هەڵدەقوڵێ و سەبارەت بە زۆرانبازی و دژواری عەرەب و زایۆنیزم و پەرەپێدانی لایەنی عەسکەری هەندێ دەوڵەتی عەرەب لەوانیش پەرەپێدانی هێزە عەسکەرییەکانی عیراق بوو ئاڵوگۆڕی نێوان هێزەکانی ئیمپریالییەوە لە پاراستنی بەرژەوەندی ئیمپریالیەتی ئەمەریکا دەگۆڕێ کە ئەمەش لەوکاتەوە دەستی پێ کرد کە بەریتانیا لە رۆژهەڵاتی کەناڵی سوێسەوە کشانەوە.

لە ساڵی ١٩٦٢دا رژێمی ئێران یارمەتی دانی خۆی خستە بەردەست بزووتنەوەی چەکداری نەتەوایەتی کوردەوە ئەمەش لە رێگای کۆمیتەی سیاسی دپ . دک ، ئەوە بوو بەڵام بەرەنگار بونەوەیەکی تەواو لە نێو کۆمیتەی ناوەندی دپ . د . ک دا بەرپابوو . دەنگی چەپرەوەکان دژ بەم بارە ورەوتە بەرز بۆوە ئەم بابەتەش بوو خاڵی ناکۆکی لە نێوان بارزانی و دەزگاکانی مەکتەبی سیاسی پ . د . ک وەوادەردەکەوێ کە ئەو پەیوەندییە لە پشت گوێی بارزانییەوە بوو هەر بۆیە بارزانی دژ بەوە دەوەستێ ئەوەی ئەم رایە دەسەلمێنێ ئەوەیە پاش ئەوەی شای ئێران نوێنەرێکی تایبەتی دەنێرێ بۆلای بارزانی و راستەوخۆ لەگەڵ خۆیدا پەیوەندی دەبەستێ، ئەمەش لە نووسراوی دامەزرێنەری یەکێتی دیموکراتی کوردستاندا لە لاپەرە ٢٨ / ی دا ئاماژەی

بۆ کراوە، لەو کاتەوە وەتا سەرەتای حەفتاکان پەیوەندییەکانی بزوتنەوەی چەکداری نەتەوایەتی کورد لە بارێکی دوو لایەنەدا دەژیا، لە لایەکەوە پەیوەندی لەگەڵ حکومەتی عیراقدا بەردەوام بوو لە هەمان کاتیشدا لەگەڵ ئێراندا گەیشتە رادەیەك کار و کردار یان یەك خەن.

لەگەڵ کشانەوەی بەریتانیا لە ناوچەی کەنداو بایەخ پێدان لە ئەمریکا بەو ناوچەیە زیاتر بوو و هەوڵی پڕکردنەوەی ئەو چۆڵاییەی ئینگلیزی دەدا لە ناوچەکەدا، بەتایبەتی لە ئەنجامەکانی جەنگی ١٩٦٧ی نێوان عەرەب و ئیسرائیل و چەند دەوڵەتێکی عەرەبیدا زیاتر سەرنجی ئەمریکایان بەرەو ناوچەی کەنداو راکێشا.

ئەمریکاش دەیویست بزوتنەوەی کورد بکاتە دەسکەلای دەستی دژ بە عیراق، وەبە بۆنەیەوە هێزە مەزنەکەی سوپای عیراق بە کێشەی کوردەوە دەبەستێتەوە لە ئەنجامیشدا ئەوزمێکی تەواو بکاتە سەر ئێران و تورکیا و پیانەکانە بارێکەوە کە بە پێویستی بزانن، بەڵکو دەبێت پەیوەندییەکانی نێوان بەرپرسایەتی ئەمریکا و بزوتنەوەی کورد پتەو بکرێت، رەنگە بۆی ئەم سیاسەتەش بەسەر ئێراندا شکابێتەوە ئەوەبوو دەستی کرد بە یارمەتی دانی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد بەو هیوایەوە کە باڵی بەسەر چارەنووسی بزوتنەوەکەدا بکێشێت و بیکاتە ئامێرێکی گوێ رایەڵی بۆ بەجێ هێنانی ئەنجامی پیلانەکانی خۆی، هەروەك لە لاپەڕە ٥٤ی راپۆرتی لیژنەی ئامادەکردن بۆ هێنانەکایەی حیزبی دیموکراتی کوردستان دا دەڵێت سەرکردەی شۆڕشی بەرەو بەرەی راست رەوییەوە دبردو پەیوەندییەکانی لەگەڵ ڕۆژئاوادا پتەودەکرد... هەربۆیە لایەنە ئیمپریالی و پاشکەوتن خوازان لە شۆڕش نزیك دەبوونەوە و بەتایبەتی پاش مۆرکردنی بەیاننامەی دوو قۆڵی نێوان عیراق و یەکێتی سۆڤیەتدا.

سەرەرای ئەو پەیوەندییانەی کە باسکران پەیوەندی سەرکردەی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد دەگەڵ قەوارەی زایۆنیدا پەرەی سەند کە زایۆنیزم هەوڵی ئەوەی دا کەڵك لەو پەیوەندییانە بچێژێت و لە بەدی هێنانی یەکێك لە ئامانجە بەرەڵایە ستراتیژییەکانی کە لاوازکردنی توانای هێزەکانی عەرەب بوو وە بەتایبەتی سوپای عیراق، ئەمەش چەقێکی گەورەی سەرەکی لە رێگای سیاسەتی فراوانکردنی دوژمنکارانەی زایۆنی رادەماڵێ و رۆڵی خۆی بەجوانی لە سەرانسەری پیلانی ئیمپریالیەشدا دەبینی.

لە ئەوەتەی شۆڕشی ١٧-٣٠ی تەمووز پەرپابووە سەردەمی کۆماریی لە لایەن پەرەپێدانەوە هەنگاوی ناوەتە قۆناغێکی نەوعی نوێوە.

ئەمەش رەنگ و بۆی خۆی بەسەر کێشەی کوردا داوەتەوە لەوەبوو حزبی دەسەڵاتدار حزبی بەعسی سۆسیالیستی عەرەب ئامادەیی خۆی دەربری دەربارەی چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتی کورد بە شێوەو شێوازێکی ئاشتی خوازانەی دادپەروەرانە، وەوەك یەکەم ئەرکی شۆڕش ئارەزووی ئەوەی دەربری کە بەهارێکاری بەرەی پێشکەوتن خوازی بزوتنەوەی کورد دان بە حوکمی زاتیدا بنێ، ئەمەش بە شێوەیەکی تەواو پێزراو خۆی لە بەیاننامەی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠دا نواند. کە بە گرنگتر گەورەترین هەنگاوی پێشکەوتن خوازی دیموکراتیانە دادەنرێ لە مێژووی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد داو هێشتا بە تایبەتی زەبر و جێژی خۆیەوە ماوەتەوە..

سەرەرای ئەوەی کە باس کرا بڕیاری ئەوە درا کە یاسای ئۆتۆنۆمی لە ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٤دا رایی بکرێت. بخرێتە باری جێ بەجێ کردنەوە.

لە لایەنی دەستووری شەوە، دەستوورە کاتییە نوێکەی کە لە ١٦/ی تەمووزی ١٩٧٠دا دەرچوو بەندێکی تایبەتی تەرخان کراوە بۆ مافی نەتەوایەتی گەلی کورد و دەقەکەش دەڵێت: «گەلی عیراق پێك هاتووە لە دوو نەتەوەی سەرەکی کە ئەوانیش نەتەوەی عەرەب و نەتەوەی کوردن.» ئەمەش شتێکی تاکە و لە وەو پێش لە هیچ جۆرە شوێنێکی تردا کە کوردی تیادا دەژی بەم جۆرە باس نەکراوە، هەربۆیە ئەو دەقە شوێنێکی مێژوویی تایبەتی خۆی هەیە لە مێژووی هاوچەرخی نوێی کورددا.

هەروەها دان بەوەدا نرا کە زمانی کوردی زمانێکی رەسمییە لەو ناوچانەی کە زۆربەیان کوردن، ئەمەو چەند هەنگاوێکی تر وەك بەشداری بوونی نوێنەرانی گەلی کورد لە بەرێوەبردنی کار و باری وڵات و سەرەرای بەشداری بوونیان لە بەڕێوەبردنی ناوچەی حوکمی زاتیدا دەرچوونی بەیاننامەی ئازار و یاسای ئۆتۆنۆمی و ئەو هەنگاوانەی کە چ لە لایەن دەسەڵاتداریی سیاسی عیراقەوە و چ لە لایەن دەسەڵاتداریی کوردوستانەوە نران بەراستی سەرکەوتنێکی مەزنن بۆ گەلی کورد و هێزە ئاشتی خوازەکان و سەرانسەری بزوتنەوەی نیشتمانی پەروەریی و ئازادی خوازی عیراق و نێو دەوڵەتی.

هەربۆیە جەماوەری گەلو هێزە سیاسییە پێشکەوتن خوازەکان پێشوازی و لایەنگیرییەکی بەرفراوانی تەواوی ئەو هەنگاوانەیان کرد. هەربۆیەش کۆنگرەی نیشتمانی دووهەمی حزبی شیوعی عیراق لە بڕیارەکانیدا، لە لاپەڕە ٤٥ی راپۆرتی لیژنەی مەرکەزیدا ئەوەی دووپات کردەوە کە رێککەوتنامەکە سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ گەلی کورد و سەرانسەری بزوتنەوەی دیموکراتی...

لە لایەنی باری گشتی جیهانییەوە، پێشوازی لەو گۆڕانکارییە پەرەپێدانەی عیراق کرا و لایەنگیری لێکرا لەوانە بروسکەی سەرۆکی دەستەی سەرەکایەتی ئەنجومەنی باڵای سۆڤیەت و سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران لە یەکێتی سۆڤیەتدا دەڵێت: «ئێمە لەو باوەڕەداین کە بەجێ هێنانی ئەو رێککەوتنە گرنگە یارمەتی پتەوکردنی یەکێتی نیشتمانی و دۆستایەتی نێوان هەردوو گەلی برای کورد و عەرەب لە چوارچێوەی کۆماری عیراقدا دەدات هەروەها دەبێتە پشتی ئەو گۆڕانکارییە ئابووری و کۆمەڵایەتییانەی کە لە وڵاتدا لە بەرژەوەندی گەلی عیراق و بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەرانی شادی گەلدا دەبن.

رێگای چارەسەرکردنی ئاشتی خوازانەی کێشەی نەتەوایەتی کورد لە عیراقدا لە لایەن هێزە گشتییەکانی لێکۆڵینەوە بلیمەتی پێدرا ئەوەتا لە

لێکۆڵینەوەیەکی پەیمانگای بەرمیندانی عەرەب لە لوبنان، لێکۆڵینەوە سیاسیەکانی سالی ١٩٧٩ لاپەڕە لە لاپەرە ١٦١ دا بەم جۆرە دەدوێ:-

((دەربارەی چارەسەرکردنی عادیلانەو ئاشتی خوازانەی کێشەی کوردو پتەوکردنی بنکەکانی یەکێتی نیشتمانی، وەك یەکەم هەنگاو، ئەرکێکە دەخرێتە ئەستۆی دەسەلاداریتی حکومەتەوە هەر بۆیە حزبی دەسەلاتدار ئامادەیی خۆی دەربری بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کوردو بنیاتنانی حوکمی زاتی، بەلام لەبجارەمیانی لەگەل بەرەی پێشکەوتن خوازی جوولەوەی نەتەوایەتی کورددا)). .

بیست و شەش سال بەسەر دەرچوونی بەیاننامەی ئازاری ١٩٧٠ی مێژوویدا تێپەربوو، ئێستاش، گەلی عیراقو هەموو هێزە نیشتمانیو ئاشتیو دادخوازەکانی ناوچەکە هەست بە رادەی خاپوور بوونو ئێشو ئەشکەنجەی گەلی کوردمان لە کوردستانی عیراقدا دەکەن کە دووچاری کارەساتێکی گشتی بووەو دەبینەوە بەجۆرێك هەموو لایەنێکی ژیانی گەلی کوردی خۆراگرمانی گرتۆتەوە. ئەویش بەهۆی دوورە پەرێز وەستانیەوە لە هەستی ڕاستو دروستو مەنتیقی ڕەوان کە بەتاڵی کردنەوەی پێشووی سەرەتای ئەم چەرخەوە خۆی پتەودەکاتو ئەوە دووپات دەکات کە تەنها پە عیراقی یەکگرتوو لە سەر بنەمای بەیاننامەی ئازاری مەزنو دوور لە هەموو هێزێکی بێگانە، کۆتایی بە دەربەدەری گەلی کوردمان دێت. بەلام ئەگەر هاتوو کێشە کورد لەم بارو دۆخی ئێستایەدا بمێنێتەوە لەڕای گومان پتر و پتر تر تووشی نوشوستیو دەربەدەری دەبێتو بەرەنگاری کۆسپو ناتەواوی مردنو کەمو کوری پێداویستەکانی ژیانی ئاساییو ئاشتی دەبێتەوە.

سەرەڕای هەموو ئەوانەی کە دەربارەی ناکۆکی یەکانی نێوان بزوتنەوەی چەکداریی لە کوردستانی عیراقدا دەوترێو لە کۆسپو نوشوستی یانەی کە ڕوویانداوە، بەلام لەوەتا بەرژەوەندی گەلی کورد بەندە بەبەرژەوەندی ئەواوی عیراقەوەو لەگەلیدا یەك دەگرێتەوە، چونکە کورد هەزاران ساڵە لە ناوچەی سەرووی عیراقدا دەژی، هەربۆیەش باری ڕووداوەکانی ئێستا پێویستی بە لادانێکی یەك کالاکەرەوەی چارنەترسانە هەیە بۆ ڕاست کردنەوەی ڕەوتی سیاسی ئەوانەی کە لە کوردوستاندا جلەوی دەستپێشخەری یان بەدەستەوەیە بۆ بەرپاکردنی ئەو لادانە، بەرەو ڕەوتی ئاشتی و یەکێتی عێراق و بوژاندنەوەی کوردوستان و بادانەوە بەلای بەیاننامەی ئازاری نەمرو پەیرەوکردنی هەموو خاڵە بنەرەتیو واتاکانی بەهەستێکی نیشتمان پەروەری و لەڕوانگەی دووربینی لە هەڵسەنگاندنی زانیارییانەی باری کوردستان لەکاتی دەرچوونیەوە تاوەکو ئەم دۆخانەی ئێستامان بەمەبەستی سوودوعیبرەت لێ وەرگرتنەوە کە دوور بێت لە دوژمنانی گەلی کوردو بەرەو پتەوکردنی یەکێتی عیراقو بەرەولوتکە بردن. . عیراقی عەرەبو کورد کە ئالای ئازادیو سەربەستیو دیموکراتیو یەکێتی نیشتمانی هەمیشە شەکاوەبێتو پەرەسەندنو گەشەکردنی تەواوەتی بۆ کوردوستانو سەرانسەری عیراق. . بەدی بهێنن ئەوعیراقەی پڕلە سامانو تواناییەو سەنگو شکۆی تایبەتی خۆی لە جیهانی ئەمرۆماندا هەیە کە داهێنانی کەلەپوورێکی فراوانە لە مێژووی ڕەسەندا. .

## ملخص البحث

## في الذكرى السادسه والعشرون لصدور بيان اذار التاريخي . . .

# جذور البيان وافاقه


د. ماجد عبدالرضا
عضو مجلس السلم والصداقة
والتضامن العراقي



الحركة القومية الكرديه برزت بشكلها الواضح خلال السنوات الاولى للقرن العشرين والاساس الاجتماعي الذي نبت جذورها فيه: كان كاطار عام نشؤ ونمو العلاقات الراسمالية في المجتمع الكردي جراء التغلغل الاقتصادي الراسمالي في الامبراطورية العثمانية التي كانت كردستان تحت سيطرتها انذاك بمعظم اجزائها وارتباطا مع تلك التحولات الاجتماعية نمت وتطورت الحركة القومية للشعب الكردي . .

ويتحدث كاتب المقال عن الحركة القومية الكردية بمعناها المعاصر ظهرت بالارتباط مع الحركة البرجوازية التركية التي اندلعت عام ١٩٠٨ في الامبراطورية العثمانية كما انها تاثرت بالحركة التحررية في روسيا وكذلك بالحركات التحررية في كل من تركيا وايران . . مع استعراض لمراحل الحركة الكردية في العهود السابقة في العراق والى اندلاع ثورة ١٧-٣٠ تموز المجيدة حيث ان حكومة الحزب والثورة ابدت استعدادها لحل المسالة الكردية حلا سلميا عادلا واعربت عن استعدادها لاقرار الحكم الذاتي وبالتعاون مع التيار التقدمي في الحركة القومية الكردية وقد تجسد ذلك كليا وبشكل ملموس في البيان الذي صدر في ١١ اذار عام ١٩٧٠ وصدور قانون الحكم الذاتي في ١١ اذار ١٩٧٤ .

وان الشعب العراقي وكل القوى الوطنية المحبة للسلم والعدل في المنطقة يرى مدى الخراب والعذاب الذي يعاني منه شعبنا العراقي في كردستان العراقية الذي عان ويعاني من كارثة شاملة لكل جوانب الحياة لشعبنا الكردي الصابر وقد جرى ذلك كله من خلال الابتعاد عن الحس السليم والمنطق القويم المعزز بكل تجارب الماضي منذ مطلع هذا القرن التي تؤكد ان الاطار الذي ينهي معاناة شعبنا الكردي هو الاطار العراقي وبالاستناد الى بيان اذار العظيم وبعيدا عن القوى الاجنبية التي كانت السبب دائما وراء ماعاناه شعبنا الكردي ويعانيه الان وسيعانيه ان هو استمر في ظل الاوضاع القائمة التي لم تسفر سوى المزيد من التدهور والموت والافتقار الى اولى مستلزمات الحياة في اجواء السلام .




هەمی عیراقییا وەلاتەکێ سەربەست دڤێت وهەمییا دڤێت بژیت بدلخوشی وکامیران و رەحەتی ئەڤلی چەندێ هەمییا خەباتا خوکر نوخوکرنە لێك دل نو نێك دەست ولەرسینگێ دوژمنێت مللەتێ عیراقێ راوەستیان نو خو راگرتوهەمی نەخش و پیلانێت رژێت کەڤنەپەریا تێکدان لو دویماهیکەك بوٚ کولەدارییێ دانا. . شورەشا (١٧-٣٠)ێ تیرمەهێ ب فوماندارییا پارتا بەعسا عەرەبیا هەڤپشکی‌لە دویماهیکەك دانا بوٚ رژێما عارفی و کوربیکا حکمی ژێ ستاند. . ئەڤە چیروکەکا دوێر و درێژە هەکە ئەم بەربەرێت دیروکا مللەتێ عیراقێ ڤەکەین وبەرێ خوٚ بدەینە بەراهیکا شورەشا (١٧-٣٠)ێ تیرمەهێ دێ بوٚمە خوٚیانو ئاشکەرابیت کو مللەتەکێ لێکگرت نەبوٚ. . هەڵکرییەکا ئاشکەرا چەبوو دنافبەرا کوردو عەرەبادا. . دنافبەرا هەمی جوینێت عیراقێدا هژاری و لەمایی نو نەخویندەواری پابەلاف بوٚ. . سەروبەرێ ئابوریێ لاواز بوٚ. . عیراق ب بوٚچهێ شانوگەرییا کولەدارییێ هوسا مللەتێ مە دژیا دناف نەخوشییادا. . هەلبەت ددەلیلێت هوسادا دوژمن دێ شێت نەخش و پیلانێت خو بجهـ ئینیت و دێ گەهینە هیڤی و ئارمانجێت خوٚ و دێ شێت خوینا مللەتی مێژیت چ بریکا هەڤالبەندێت خوٚیان کری گرتیێت خوٚ. . ئەوێت مللەتێ خوفروٚتی و ئەوێت گیانێ نیشتمانی نەهاتی و چوروی دناف خوینا لەشێ واندا. . ئەڤ سەروبەرێ ئالوز بوٚ بنگەهەك داکو گەنج و خورتێت عیراقێ خەباتێ بکەن ژبەرخاترا رزگارکرنا مللەتێ عیراقێ ژلێ چیروکێ خەباتا شورەشا (١٧-٣٠)ێ تیرمەهێ دەستپێ کر. . پشتی کو شورەش سەرکەفتی. . پێنگاڤا ئێکێ ئەوا هاڤێتی ئەو بوٚ ئاڤاکرنا ئێکگرتنیا نیشتمانی وچارەسەرکرنا خلمەتا کوردی و دەرکرنا بەیاننامایا (١١) یازدەی ئاداری چونکو شورەشێ گەلەك سەربوری بوٚ خوٚ وەرگرتبون ژ هەڤرکییا عیراقێ دگەل کولەدارییێ نو شورەش پێحەسیا کو هەمی گاڤا دوژمنێت مللەتێ مە دڤێت هیڤی وئارمانجێت خو بجهـ بینن ب رێکا پەیداکرنا ئالوزی وگرفتارییا لناف مللەتیدا. . وبەیداکرنا ئاستەنگا دریکا پێشکەفتنێدا ئەڤێ هەڤرکێ ژی دەستپێکر ژدەستپێکرنا هەڤرکییا دنافبەرا کوردو عەرەباندا لعیراقێ. .

نەیێ ژلایەکی‌ڤە نو ژلایەکێ دیڤە شورەش ب ئەڤلی چەندێ ژی رازی نەبوٚ. . فوماندارێت شورەشێ هزردکر ودگوت هەکە مە دڤێت مللەتێ مە بژیت ب سەر بلندی هەلبەت دڤێت ئەم سامانێ وەلاتی نو ئابوریێ وەلاتی رزگاربکەین ژبن دەستێ دوژمنی. . ئیجا پێنگاڤادوی ژپێنگاڤێت شورەشێ هاڤێتین ئەوژی خومالی‌کرنا گازێ بوٚ. . پشتی ئەڤ گرفتاری وئالوزییە بدویماهیك هاتی فوماندارییا شورەشێ دەست ب ئاڤاکرنا سنعەتکارییا نیشتمانی‌کر و کارگەهـ ئاڤاکرن نو ژلایێ چاندنێ و سەخبیرکرنا چاندنێ‌ڤە فوماندارییا شورەشێ بریاردا ب بەلاڤەکرنا ئەردی لسەر جوتیاراو هاریکارییا جوتیارا بهێنەکرن داکو بشێن درامەتێ خوو منالێ خوٚ. . بجهـ بینن. . هوسا شورەشێ دویماهیکەك دانا بوٚ دەرەبگینیێ. . نە بەس ئەڤە بەلکو شورەشێ پێنگاڤێت بەرفرەهـ هاڤێتن لمەیدانا رامیاری و بازرگانی وسنعەتکارییێ هەروەسا شورەشێ تێکەلیێت خوموکوم کرن دگەل دەولەتێت هەڤال نو دەورێ عیراقێ یێ دیار بوٚ لناف هوٚلێت وەلاتێت ئێکگرتیدا نو دەستێ هاریکارییێ درێژکر بوٚ بزاڤێت رزگاریکرنێ لجیهانێ نو ئەرازی بینا خو دیارکر لسەر رامیارییا توخم پەرێسی لجیهانێ وخەبات و بزاڤا عیراقێ پشتی شورەشێ یا دیار و ئاشکەرا بوٚ. . لناف کوٚنگرێت دەولەتێت بزاڤا بێلاو پاریزتنا تەناهییا دەولەتان. . ئەڤە ژلایێ رامیاریا دەرڤە. . ئیجا دەمێ ئیمپریالیزمێ نو کولەدارییێ ئەڤە هەمی دیتی و هەستپێ‌کری. . بینا هەولدا بەراوەستاندنا خرخالا پێشکەفتنێ لعیراقێ نو شورەشا (١٧-٣٠) تیرمەهێ ئینا رابوٚ ئیرانا دوژمن پالدا لو بەرهنگاری عیراقێ‌کر و ئاگرێ شەری ب عیراقێ داکرن. . هەمی ژبەرخاترا داکو دربەکی بدانە عیراقێ نو عیراقێ ژمللەتێ عەرەبی دوێربێخن. . لەو شورەشا (١٧-٣٠)ێ تیرمەها پیروٚزیا سالا (١٩٦٨) ژنەخش و ریکخستنا پارتا بەعسا عەرەبی یا هەڤپشکییە ئەوا سەروکێ فوماندار (صدام حسین) نەخش بوٚکێشای نو پریڤەبری هەتاکو وەلاتی وکورێت مللەتی لدوٚر خرڤەبووبن نو لەجەمیاین چونکو پارتا سەرکێش هاتە ریکخستن ژناڤ وان نەخوشییادا ئەوێت مللەتێ مە تێدا دژیا وکورێت مللەتی هەمییا ئاگەهـ ژسەروبەرێ ژیانا مللەتی هەبوو. . دبێزاربوون ژوێ دەستەکا حکم دکر ل سەر مللەتی ئەوا گرێدای ب کولەدارییێ‌ڤە لو ئیمپریالیزمێ. . هەروەسا ئارمانجا وان کوربیکا حکمی بوو نو مێتنا خوینا مللەتی ژبەرهندێ لوان سالێت سیهێ نو چلێ نو پێنجێ. . هەکە سەحکەینە بەربەرێت وێ دێ بینین چ کارگەهێت وەسا لناف وەلاتێ مەدا نەبوون. . چ پروٚژێت ئابوری نەبوون و نەدانابوون بوٚ چارەسەرکرنا ئالوزێت ئابوریێ مللەتێ مە. . ئێش

ونەخویندەواری یا بەلاڤە بو . ڤیجادەمێ کوربێت مللەتێ هەست بلێ زیانا
تەعل کری ئێك سەر خرڤەبوون لبن ئالایێ پارتیا بەعسا عەرەبی یا

هەڤپشکی ئەوا بیروهزریێت پێشکەفتی لدەف پەیدابوویین ئو ئەو
دروشمێت بەرکەفتی ئەوێت دژی کولەداریێ ئو کەڤنەپەرێستی

بلندکرین . . هوسا پارتێ پاشەروژەکا روهن دانا بەرسینگێ وەلاتێ یا
ومللەتێ ئوهیڤی و ئارمانج بو خەلکی دانان لدویڤ بیروهزریێت
نەتەوایەتیێ ئو یێت مروڤایەتیێ بو ئاڤاکرنا مللەتەکێ ئێکگرتی . . ئەگەر
قوناغا پێش ژدایکبوونا پارتێ قوناغەکا ئالوز و نەخوش بیت ل دەف مللەتێ

عەرەبی بەلێ پارتێ بەجهـ کر کو پێدڤییە ئێکەتیا نیشتمان بهێتە پاراستن
وریك بهێتە گرتن لبەرامبەری پیلانێت ئیمپریالیزمێ وکەڤنەپەرستێ ڤیجا
روژ بو روژێ نیشانا سەرکەفتنا شورەشێ یا دیاربو . . بنەجهـ دبوو ئو
گەش بوو . . هوسا پارتێ هەولدا ببیتە کێ هشیار و زیرەك وکاربکەر

بیروهزریێت شورەشگێرانە یێت کەتواری و مەوزووعی بەرچاڤ بکەت هەروەسا یا ئاگەهدار بوو کو شرولەکرنا قوناغا بەری
شورەشێ یا پێدڤی بوو داکو بو خو سەربوریێ وەربگریت ژ سەروبەری
ژیانا مللەتێ ژبەرخاترا ئاڤاکرنا مللەتەکێ پێشکەفتی و داکو دویر بکەڤیت

ژهلنگا ڤتنێ و خاربوونێ ئو سەرداچوونێ . . ڤیجا هوسا نیشانا وێ یا
ژهەمییا باشتر ئەو بوو وەکومە گوتی کو قوناغا بەری خو شرولەکر ئو

پروگرامەکێ بەرفرەهـ بو قوناغەکا باشتر دانا نەفەرزی دزڤریت کو چونکو
پارتیا بەعسا عەرەبییا هەڤپشکی نەکو پارتەکا چوینەکێ بتنێیە بەلکو هەمی

چوینێت چڤاکێ یا مللەتێ عەرەبی دگریت ڤیجا هوسا دیت کو
دەستکەفتێت پارتێ دهەمی مەیدانا دا بن چ مەیدانا چڤاکێ یان رامیاری

یان ئابوری یان رەوشەنبیری ئو مروڤایەتی . . فەلەوژی هەمی دزڤریتە وێ
ژیاتا بەرکەفتیا سەروکێ ئوماندار بویە سەرکێشێ کاروانێ خەباتا پارتێ
ئو دهەمی قوناغادا پربهەبر . . لەوا هەمی نەخش و پیلانێت هاتینە دانان بوو
شورەشێ بەر ئاڤێدا چوون ئو هەولدانێت خودا داکەفتن و سەرنەکەفتن

بەلکو هەمی گالا . . سەرکەفتن بارا پارتێ بوو بەلێ پیلانا ژهەمییا مەزنتر ئەو
بوو . . ئەو شەرێ دوژمنانەیێ یا ب عیراقێ دایەکرن ئو ئەڤ شەرە هەتا نهو یێ

بەردەوامە . . بەلێ وەسا دیار بو کو لەشکەرێ مە وکوریێت وەلاتێ دەستێت
خو یێت ئێکگرتین ئو بەرەڤانیا وەلاتێ دکەن ئو لمەیدانا ستەمکاریێ یا
لەشکەریدا مللەتێ خەم ژێ خار و خو پێلەپەوەستاندنو ماندیکر ژ بەرخاترا
دابەرهەمەکێ باش چێکەن بو خوشمێرێ مللەتێ . . ئەڤەژی داکو

پێدڤیت لەشکەری بجهـ بینن . . وەلاتێ مە نەکەڤیتە لبن ستەمکاری یا وان
و بجهـ ئینانا هیڤی و ئارمانجا وان هوسا عیراقییا دلیا خو دویربێخن
ژگڤاشتنا دەولەتێ . . . ژلایەکێ دیڤە هەکەبەرێ خو بدینە بەرامبەکا
شورەشا (١٧-٣٠)ێ تیرمەهێ دشێین بێژین راستە عیراقێ بن دەستا
ئیمپریالیزمێ نەبوویە ئو بنگەهێت بیان ژی ئێ نەبوویە بەلێ خوسەرییا
نیشتمانێ یاست و خاڵ بوو . . بەرگفابوو . . ڤیجا دڤوناغا بووریدا
سەربورییا پارتێ دجهنگا خوسەرییا نیشتمانیدا دەولەمەندبوو . . ئو
بکوبری دیارکر کو پێدڤییە بزاڤ بهێتەکرن بو موکمکرنا پاریزتنا
سەربەستییا نیشتمانێ . . ب ریکا خوسەرییا رامیاری ئو ئابوری و
لەشکەری ژبەر ڤێ چەندێ پارتێ و شورەشێ خەمەکا مەزن ژ خلمەتا چەکی
ئو بەرهەمێ چەکێ لەشکەری خار . . چونکو دڤێ قوناغێدا ئەڤ خلمەتە
گەلەکا پێدڤییە بو پاریزتنا خوسەرییا رامیاری ئو سەربەستییا نیشتمانێ .
لەلەو یاهەژێ گوتنێیە ل پێش شورەشا پارتێ عیراقێ چەك وەردگرت
ژسەروکانییەکێ بتنێ ئەو ژی ئێکەتیا سوڤیەتێ بو . . ئێکەتیا سوڤیەتێ
یاراست هاریکارییا عیراقێ دکر . . بەلێ لدەمێ رژێما ئیرانێ شەر
ب عیراقێ دایەکرن بو پارتێ ئو شورەشێ وەسا دیاربو کو هەکە خوبهێلیە
ب هیڤیاوەلەتاڵەدێ داکەڤیت دپاریزتنا نیشتمانیدا . . ڤیجا ل ڤێ دەلیڤێدا
فوماتدارییا پارتێ و شورەشێ بزاڤەکا دیکر ئو ریکەکا دی دابەرسینگێ

کاروانێ ریڤەچوونا خوورابو و هەڤالێت خوبەرهەڤکرن دگەل دەولەتێت
جیهانێ ئو بشارمزاییا چەکی ژدەڤ وانکری ئو کارگەهێت چێکرنا چەکی
دانان ئو تەکنولوجییەکا باش بدەست خولە ئێخست و چارەسەرییەك
دانا بو وان ئاستەنگا ئو گرفتارییا . . لو شیا دەهەمیێت خو بداڤوتیت ژوان
ئاستەنگا وشیا رابیت ب راستییا کرپاریێت گوهوریێ هوسا پارتێ خو
راگرت لبەرسینگێ هێزیت جهێ یێت خوکرین لناڤ مللەتێ مەو رەهـ و
ریشالێت خو بەلاڤەکرین ئو شیا دەوبا هیکەکێ بو بدانیت جارا مە گوتی
دەستێ بیانییا دناڤ مللەتێ دابوو . . ب هێجەتا کو ب عیراقێ لە نابیت . .
رابیت ئێشێت ئابوریێ خو چارەسەربکەت ئو پێش بێخیت ئەڤەژی دزڤریتە
چەند نەگەرا ئەوان لەگەراگریدانەکاهەی ب لایێت رامیاری و چڤاکی ئو
ئابوریڤە . . بو نمونە دەولەتێت کولەداریێ هێجەت دگرت ئو دگوت
دەرهینانا گازێ ئو پاقژکرناوێ ئو هنارتناوێ بو دەرڤەی وەلاتێ ئو شیانێت
دەراڤێ ئو هونەریێ و ریەریێ پێدڤین مە باوەرە نەڤشیانێل دەف حکومەتا
عیراقی یا وێ دەمێ پەیداتەبوو . ئو بێ چێنەدبوو . . ڤیجا ئەوان ئەڤ
هێجەتە بوخو دگرتن داکو ب کەیفا خو یێك هاتنا گریدەن و ئور بکەن

دگەل کومپانیا ئێجا دەمێ شۆرەشگێرا هەست ب ڤێ ئورناغی دری ئو ڕابووینە سەرخۆ ئێجا دەستەکێت تەمەعکار ب جاڵەکێ نکامی ئو ئوژمنایەتی بەریخۆدا شورەشێ ئو بۆ نەخش و پیلان د. نان ئو ئاستەنگ ئو نەخوشی ئێخستە دڕێکا کاروانێ شورەشێدا داکو هیڤی ئو ئارمانجێت خو بجهـ بینن وەك زەوشتێ لەلی شەری بێ دیار و ئاشکەرا. . کو سەری زۆرێکا سەربلندێ چێترینن. . لە لە یاهاتی دلەرەەنگا خەباتێدا ئو ژیەرخاترا ئازادیێ. .

ژێدەر :

پەنکی سەرکەلتنا هەمی گاڤا ددەمێ عێراقیدا بوو ل دوماهیکێ ج رێك


١-صدام حسين، الحكم الذاتي وعمق وحدة العراقيين.

٢-ميشيل عفلق. معركة المصير الواحد، المؤسسة العربية للدراسات والنشر. بيروت لبنان.

٣-اعداد من مجلة الثورة العربية. يصدرها مكتب الثقافة والاعلام القومي لحزب البعث العربي الاشتراكي.

٤-راپورتا مەلبەندی یا کۆنگرا نەهێ یا پارتا بەعسا عەرەبی یاهەڤپشکی ١٩٨٢.

٥-خليل مراد. حرب الخليج وانعكاساتها على الامن القومي العربي، بغداد ١٩٨٧.

٦-الصراع العراقي الفارسي، تاليف مجموعة من الباحثين بغداد.

٧-امين هويدي، الامن العربي في مواجهة الامن الاسرائيلي. بيروت دار الطليعة سنة ١٩٧٥.

٨-د. فاضل البراك، استراتيجية الامن الداخلي. وزارة الثقافة والاعلام. بغداد ١٩٨١.

٩-د. فاضل البراك تحالف الاضداد بغداد.

١٠-عبدالقادر فهمي. الحرب العراقية الايرانية واثرها على الامن القومي العربي. مجلة افاق عربية.






ان ابناء ثورة (١٧-٣٠) تموز منذ بدأها واستمرارها تعرضت الى ضغوط ومؤامرات بكافة الزوايا الاقتصادية والسياسية والعسكرية وغيرها مما يمس الحياة العامة ويؤثر فيها انها كلها قد حظيت باهتمام الاوساط المعنية سواء في داخل القطر او في الوطن العربي او على المستوى العالمي. ان الثورة (١٧-٣٠) تموز بالنسبة للشعب العراقي والامة العربية لها دور عظيم تسامى في تاثيرها وفاعليتها على كل الاحداث الخطيرة التي مرت على العراق وعلى الامة العربية او بما احدثت من تغيرات ومستجدات في الساحة العربية وطنا وشعبا وبما احدثت من تحولات اجتماعية ونفسية وحضارية وصناعية وثقافية في القطر العراقي وبما احدثت في قلب الموازين في الاوساط الدولية في مجال التعامل مع العراق. . يتناول كاتب المقال الظروف والاوضاع التي كانت سائدة قبل ولادة حزب البعث العربي الاشتراكي وكيف كان اعلان الحزب على الساحة العربية ايذانا بعهد جديد يرتقي بالنضال القومي لمقارعة اوضاع التجزئة والتخلف والقوى المرتبطة بتلك الاوضاع وكيف استطاع الحزب بعد تسلمه السلطة ان يحقق قدرا واسعا من الانتصارات في كافة الميادين ويشير الكاتب في مقاله الى المؤامرات الامبريالية والصهيونية والايرانية والامريكية وقوى الرجعية للحد من مسيرة الثورة



شەعبان مزیری






خۆشم نازانم من بۆچی وەهاشەیدای بنەو بنچینەی ناو بووم بەجۆرێك وای لێکردم کتێب لەسەر ناوی شار و شوێنەکانی لای خۆمان بنوسمەوە. یەکەمیان (اصول اسماء المدن والمواقع العراقیة) ساڵی ١٩٧٦ لەچاپ درا. دوای ئەویش ساڵی ١٩٨٩ جارێکی تر ئەوکتێبەم بە شێوەیەکی فراوانتر بە دوو بەرگ لەچاپ دایەوە. بەرگی یەکەم هەر بەو ناوەوە کەوتە بازارەوە. بەڵام بەرگی دووەمم بە داخەوە کەوتە گێژەنەی سەردەمی گرانی یەوە گرانی کاغەز و چاپەمەنی و هەیتوهوون تر، هەروا ساوەتەوە چاوەڕێی هەڵ قایی کردنەوەیە. بەرگی یەکەم زۆربەی ناوی شار و دیهاتەکانو شوێنەکاز کوردوستانی لای خۆمان تێدا هاتوە جگە لە شار و شوێنەکانی سەرجەم عیراق

بە هەر حاڵ ئەوەی لێرە شدا پێشکەش کراوە بنچو بنچینەی ناوی هەندێ شوێنی دەرەوەیە. جگە لە لێکدانەوەی واتای هەندێ ناوی عەرەبی کە هەر لە ژیانی رۆژانەماندا بەکاریان لەهێنین و واتاکانیان نازانین.

خوێنەواری بەڕێز: تۆ هاوڕێی کەت بە (ابو طلال) یاخود (ابو فراس) یا (ابو زینب یا ابو رباب) بانگە ئەکەیت. تۆ جگە لەوەی ناوەکەی خۆی بە دەگمەن لەزانیت. ئنجا ناشزانی ناوی کورەکەی یا خود کچەکەی بە - نای چی دیت. بۆیە ئەڵیم (واتای) ئەو چەند ناوەی لێرەدا هاتون بێ سود نیە.

- ابو الهول (ئەبو هەول)

ناوەکە لە بنەرەتدا (کنعانی) یە واتا (بوحول)ە گوایە لەبەر ئەوەیەکە زۆر لە (حول)ی خوای کەنعانیەکان ئەکات. وردەوردە ناوەکە لە (بوحول)ەوە، بۆتە (ابو الهول) و یەکێکە لە (هرم)ەکانی میسر.

- ارجنتین (ئەرجەنتین)

یەکێکە لە وڵاتە گەورەکانی ئەمریکای خواروو. ناوەکەی ئیسپانیە، (ارجانت) بە واتای (زیو) دێت.

- اریحا (ئەریحا):

لە فەلەستینە. شارێکی مێژوویی کۆنە نزیك بە روباری ئوردون و (خواردن) و ئەکەوێتە رۆژهەڵاتی شاری (قدس). گوایە بەناوی (اریحا)ی نەوەی (ارفخشلی کوری نوح) ەوەیە وتەو بنیان ناوە.

- ازهر (ئەزهەر):

لە کانی خۆیا (جەوهەری صقلی) لە شێوەی مزگەوتا بنیانی ناوە، ئەم پیاوە پێشەوای لە شکری فاتمیەکان بوو لە میسر، ئەویش دوای دروست کردنی شاری قاهیرە بوو کە لە ساڵی ٣٦١ك بەرامبەر بە ٩٧٢ز هەر لە لایەن فاتمیەکانەوە بنیات نرا. ناوی فاتمیەکان بە ناوی فاتمەی کچی پێغەمبەر (محمد . د) ەوەیە. (زهراء) یش ناسناوی فاتمەیە و ئەزهەریش لە (زهراء)ەوە هاتوە. (زهراء) یش لە عەرەبیدا زیاتر بە ئافرەتی رووگەش وسپی وتە، ان ئەوەتری، (زهیر) یش بە واتای سپیکەلە دێت.

- استراخان:

لای خۆمان (هەشتەرخان) یان پێ ـ روت. لە کاتی خۆیدا کەلێك لە بازرگانەکانی سلیمانی بۆ کار و باری بازرگانی گەیشتوونەتە ئەوێ یەکێك لەوانە حاجی ئەمینی کاکەحەمە بوو. لێرەوەشیان ئەبردو لەوسەرەوە (وەرشاو) وشتی تریان ئەهێنا، لە هەمووی زیاتر (سەماوەر) بوو. ئەوسا یەکێك بوو لە بەندەرە گرنگەکانی رووسیا: ناوەکەی لە ناوی جۆرێك لە ماسی یەوە هاتووە کە پێی ئەڵێن (STVRGEON) هەر ئەم ماسیە شە کە

(کانیار) ئەدات.کانیار یش هێلکەی ئەم ماسیانەیە کە زیاتر (هێزی جنسی) بە خواردن زیاد ئەبێت.

- اسکندریە :

گرنگ ترین شار و بەندەری میسرە، ئەسکەندەری گەورە لە ساڵی ٣٣٢ پ. ز دروستی کردوەو بە ناوی ئەوەوە ناونراوە.ئەم شارە ئەکەوێتە سەر دەریای سپی ناوەراست.

- استانبول :

ناوەکانی لەوەپێشی (ئاستانە) و(قوستەنتەنیە)و (بیزنتە) بوو. یەکەم شاری تورکیایە لە سەر دەریا.

- اسوان :

شارێکە لە (صعید)ی میسر. جارجار بە (اصوان)یش ناوئەبرێت ئەکەوێتە سەر روباری نیل لە ناوچەی (نوبە)دا. لەوەپێش (یبو)یان پێ ئەووت، هەروەها (سونیت)و (سینە). حەوزی ئاوی اسوان کە لە ئەنجامی دروست کردنی (سدالعالی)دا لە سەردەمی سەرۆکی خوالێخۆشبوو جەمال عەبدول ناسردا پەیدابوو، گەورەترین کار بوو کە لەو سەردەمەدا لە میسر هێنرایەدی.

- اغادیر :

شارێکە لە وولاتی (مغرب) لەسەر دەریای ئەتلەسی.اغادیر یاخود (اجادیر) ووشەیەکی (بربر)ەکانە بە واتای (دیوار)دێت بەڵام وادیارە بنەچەی ناوە کە ئەگەرێتەوە بۆ سەردەمی فنیقیەکان. هەر ئەم شارەبوو کە چەند ساڵێك لەمەوبەر لە ئەنجامی بوومەلەرزەیەکی بێ ئامانداز زۆری وێران بوو.

- افغانستان :

شوێنی ئەفغانەکان. لەوەپێش (خراسان) یان پێ ئەووت بەوەداکە ئەکەوێتە بەشی رۆژهەڵاتی وولاتانی ئیسلام(خور - ئاسان) یش بە واتای ئەو شوێنە دێ کە خۆری لێ هەڵدێ. بەڵام پێش هاتنی ئیسلام بە خوراسان وتراوە (آریانا)

- ئوروپا :

لە بنەچەدا ناوە کە یونانیەو بە واتای (وڵاتی بڵاو) دێت. هەندێکیش ئەڵێن گوایە ناوەکە (ارامی)یە بە واتای (رۆژئاوا) دێت.

- اردن :

لە زمانی عەرەبیدا بە واتای (خەواڵو - النعاس) دێت. بەڵام زیاتر بە واتای زۆر وسەرکەوتن (الشدة والغلبة) دێت. لەلایەکی ترەوە ئەڵێن (اردن) و(فەلەستین) هەردوکیان جووت کوڕی (سام کوڕی ارم کوڕی سام کوڕی نوح) بوون.

- ام القری :

ناوێکە لە ناوەکانی (مکە)ی پیرۆز. ئەڵێن لەبەر ئەوەی کە بنەچەی زەمینە بۆیە وای پێ ووتراوە. واتا کۆنترین دێیە لە گشت دوورگەی عەرەبدا و لە گشتیان گرنگترەو لەهەموز یاتر رووی تێ ئەکەن.

- اورغوای :

وڵاتێکی ئەمەریکای لاتینیە. بە ناوی (اراغونا) وەناونراوە کە روبارێکی درێژە لە (برازیل) ودرێژیەکەی ١٨٠٠ کیلومەترە و لەگەڵێك شوێنی گوێزو بارەکە (کانی ئەڵماس) هەیە.

- اولان باشار :

پایتەختی کۆماری (منغولیا)یە کە دانیشتوانی نزیکەی دوو ملیون کەسن بەڵام پانتایی وڵاتەکە بە قەد هەموو وڵاتی هندستان ئەبێت و زۆری دەشتە. اولان باشار بە واتای (پاڵەوانی سوور - البطل الاحمر) دێت.

- البحر الابیض المتوسط :

زووتر عەرەب پێ یان ئەووت دەریای روم، جگەلەوەی گەلێك ناوی تری هەیە وەك دەریای (مغرب و مغربی وغربی)و دەریای (رۆم و رۆمی و افرنج)و دەریای (شام و شامی). هەروەها دەریای (خوێ) شی پێ ئەووتری و بە تورکی (آق دکز) و هەندێك جار دەریای سەوزیشی پێ ئەڵێن بۆ ئەوەی لە دەریای لە ئەوەی جیابکرێتەوە کە دەریای (تاریکستان) یان پێ ئەووت.

بحرین :

لە راستیدا خۆی لە چەند دوورگەیەکی بچووك پێکهاتوە لە ناو ئاوا لەوەپێش (اوال) وپێش لەویش (دلمون) وپێشتریش (تیلوس) یان پێ ئەووت.

بندقیە :

شاری (فینیسیا)ی ئیتالی یە. کە بە شاری هونەرو جوانی بەناوبانگە. بندقیەش لێکدانەوەی (بونز دونشیا - الدوقیة الجمیلة)ی عەرەبی یە.

برازیل :

ساڵی ١٥٠٠ لە لایەن (کابرال)ەو، دۆزراوەتەوە. ناوەکەش لە ناوی دارێکەوە هاتووە کە زۆر بڵاوە لەو وڵاتەدا ناوی (بریسیل)ە وڕەنگی سووریان لەم دارە دەرئەهێنا و وەك بۆیە بەکاریان ئەهێنا.

البحر الاحمر :

لەمەوپێش (قولزوم) یان پێ ئەووت بە ناوی شاری قولزومی کۆنەوە کە ئەمرۆ شاری (سویس)ە لە میسر. ئێستا دەریای سووری پێ ئەڵێن بە هۆی ئەو رووەکە ئاوەنیایانەوەکە تیا ئەژین و ئیوارانێ لە کاتی خۆراوا کە تیشکی رۆژیان لێ ئەدات رەنگێکی سوور ئەدەنەوە.

برج ایفل :

ئەم بورجە ئەندازیار (ایفل) لە پێشی ئاسن لە پاریس دا دروستی کرد. هەر ئەم پیاوەش بوو هەیکەلی (تمثال الحریە)ی وەك دیاریەکی گەلی فەرەنسە بۆ گەلی ئەمەریکا دروست کرد.

بنجاب :

لە پاکستان رۆژئاوادایە. ناوەکە بریتیە لە دو ووشە (پەنج یاخود پەنج یاخود پێنج)و (آب یاخود ئاو) واتا وڵاتی پێنج رووبار.

البيت الابيض:

لەواشنتۆن سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکان ئەمریکای تیادا نیشتەجێیە. ساڵی ١٨١٢ وڵاتە یەکگرتووەکان (جارێ) شەڕیان دا دژی ئینگلتەرە. ساڵی دوایی دیسان ئەمریکا هێرشی بردە سەر کەنەدا و سەرنەکەوت. بۆیە ساڵی ١٨١٤ بریتانیا هێرشی بردە سەر واشنتۆن و داگیری کرد و دەستی کرد بە سووتاندنی زۆر شوێن گرنگ لەوانە نیشتەجێی سەرۆکی ئەمریکا بوو، دوای ئەوە ئەمریکاییەکان هەستان مەنزڵگای سووتاوی سەرکۆماریان بە بۆیەی سپی بۆیە کردەوە، بۆ ئەوەی شوێنەواری سووتاوییەکەی بشارنەوە. لەبەر ئەوە لەو کاتەوە ئەو شوێنە ناونراوە (البيت الابيض).

بيت لحم:

ڕەنگە هەیە هەندێک کەس لەو (لحم)ە بە گۆشت تێ بگا بەڵام لە ڕاستیدا ئەو (لحم)ە بە زمانی (سریانی) یە و بە واتای (نان) دێت.

بۆلیڤیا:

وڵاتێکی ئەمریکای خوارووە و بە ناوی پێشەوای ئەمریکای خواروو (سیمۆن بۆلیڤیار)ەوە ناونراوە کە شۆڕشی لە دایکبوونی لە نزیکەوە بوو دوای مردنی ناشتنی لە (کولومبیا) بوو.

تاج محل:

کۆشکێکی ڕازاوەی زۆر جوانە لە (اجرا) نزیک (دلهی) لە هندستان. لە بناغەدا وەک گومەزێک بۆ شاردنەوەی لاشەی (ارجومەند ژنی شاجیهان) دروست کرا کە (ممتاز محل) یشیان پێ ئەوت. ئەمەش وەرگێڕا و بوو بە (تاج محل) شاجیهان ئیمپراتۆری هندستان بوو، خۆی لە بنەچەدا موسوڵمانێکی مەغوولی بوو لە ساڵی ١٦٢٨ ـ ١٦٥٨ حوکمی کرد. ژنەکەی زۆر خۆشەویست و چوار دە منداڵی لێی بوو کە مرد ئەو گومەزەی لەسەر گۆڕەکەی دروست کرد.

تایلاند:

یەکێکە لە وڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لەوەپێش (سیام) یان پێ ئەوت. تایلاند بە واتای (زەمینەی ئازادی) دێت.

ترفلگار:

یاخود بە عەرەبی (الطرف الاغر). مەیدانێکە لە لەندەن. لە ناوەڕاستەکەیدا پایەیەک لە مەرمەڕ هەستاوە کە بەرزاییەکەی (١٨٥) پێ یە، ئەمەش بە ناوی ئەو شوێنەوەیە کە شەڕە دەریاییەکەی بە بێی فەرمانی ئەمیرالی ئینگلتەرەی تیاروو و داو سەرکردەی هێزەکانی ئینگلیز (نلسون) لە نزیک (کەرتی طارق ـ جبل طارق) لە باڵ گابەری نێکابوو کە عەرەب پێی ئەڵێن (طرف الغار) و بە شکاندنی فەرەنسییەکان کۆتایی هات.

کناری Canary:

چەند دوورگەیەکی سەر بە ئیسپانیان نزیک بەستووری ئەفەریقا. ئەمانە دوورگەی گەشت و گەشتیارەکانن. ناوە کۆنەکەیان (دوورگەی بەختەوەرەکان) بوو. بەڵام کەناری بە لاتینی Canara بە سەگ ئەووترێ. ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە سەگی زۆر لەو دوورگانەدا ئەژی.

جزر القيمر:

لە دەریای (هندی) دان و لە وەپێش لە لایەن فەرەنسییەکانەوە داگیر کرابوون تاکو لە ساڵی ١٩٧٥ دا سەربەخۆ بوون. دانیشتوانیان نزیکەی چوارسەد هەزار موسوڵمانن کە لە کاتی خۆیا ڕێ یان لە کەنگوتنە ئەوێ و نیشتەجێ بوون. بە زۆری (گوڵ) ئەفرۆشن بە دەرەوە. ناوەکەی بە واتای (سپی) دێت.

حبشە:

ناوە عەرەبییەکەی حەبەشەی (حبش)ی عەرەبییە کە لە کاتی خۆیدا لە دوورگەی عەرەبەوە و بەرەو کای دەریای سوور دا پەڕیونەتەوە و لەم شوێنەی ئێستایانا نیشتەجێ بوون. بەڵام ئەوروپییەکان لە دوایدا ئەم وڵاتەیان ناونا (ابی سینیا Abyssinia) بەڵام ئێستا خەڵکی وڵاتەکە هەر (اثیوبیا)ی پێ ئەڵێن، کە لە بنەڕەتدا وشەیەکی یونانی ڕەگەزە و بە واتای (ڕووی سووتاو) دێت چونکە یونانییەکان زوو، ئەم ناوەیان لە دانیشتوانی وڵاتی (نوبە)ی خوار میسر و سودان و حبشە نابوو، تاکو لە دوایدا هەر تەنها بە حبشەوە گیرسایەوە و بە سەر ئەو دابڕا.

سوربون:

ناوی کۆلێجی ڕێزمو زانیارییە لە دانشگای پاریس. هەندێک جار هەر بە خۆشی ئەڵێن دانشگای سوربون. ئەمیش بە ناوی دامەزرێنەرەکەیەوەیە (روبیر سوربون) کە قەشەیەک بوو لە سەردەمی لویسی نۆهەمدا قوتابخانەیەکی کردەوە بۆ خوێندنی تایبەتی لاهوتی بە دەست کورتەکان. دوای ئەوە بوو بە کۆلێجی وێژەو زانیاری و لە دوایشدا بوو بە هەوێنی دانشگای پاریس.

ماراثون:

ئەمڕۆ ناوی ڕاکردنێکی بە کۆمەڵە و لە سەر خۆیە بەڵام ماراثون خۆی ناوی شارێکی کۆنی یونانییە. ساڵی ٤٩٠ پێش هاتنی مەسیح شەڕێک لە بەینی دانیشتوانی (اثینای یونان) و فارسەکاندا ڕوویدا و بە سەرکەوتنی ئەثینایەکان کۆتایی هات. بۆیە لە خۆشیانا یەکێک لە سەربازە یونانییەکان لەو شارەوە کە تیا سەرکەوتن بە ڕاکردن بەرەو ئەثینا کەوتە ڕێ بۆ ئەوەی مژدەی سەرکەوتنیان پێ بدات. بەڵام دوای گەیشتنی ئەوەندەی نەبرد لە ماندوویە تیدا مرد، بۆیە ناوی ئەو شارەکە ماراثون بوو نرا بە سەر ئەو ڕاکردنەدا بۆ بە یادکردنەوەی ئەو سەربازە ئەمرەکە بە درێژایی ٢٦ میل بە پێ پەلەی هەڕای کرد.

ئەم ناوچەیە دێتە خوارەوە.

**سیناء:**

ئەونیمچە دوورگەیەیە کە ئاسیاو ئەفەریقاپێکەوە ئەبەستێتەوە لە بنەچەدا ناوەکە ناوێکی (اکد)ی کۆنە بە واتای (خوای مانگ) دێت ولای میللەتانی سامیەکانی کۆنیش بە واتای (زەمینەی مانگە) جەسپاوە.

**قبرص:**

ناوەکەی لە (کیپریوس)ی لاتینیەوە هاتوە کە بە واتای (زەرد ـ نحاس) دێت.

**کنیسەی قیامە:**

لە (قدس) شاژنە هێلانە دایکی (قسطنطین) ساڵی ٣٣٥ز کە سەری لە (قدس)دا، فەرمانی دەرکرد بۆ دروستکردنی ئەم کڵێسەیە. بۆیەپێی ئەڵێن کڵێسەی قیامە، بەو بڕوایەی عیسا پێغەمبەر لە کاتی خۆیا لەوێوە (هەڵساوە) و بەرەو ئاسمان سەرکەوتوە.

**مقادیشو:**

پایتەختی صوماڵە. گوایە بە زمانی دانیشتوانی ئەو ناوە (مقدشو) ئەو شوێنەیە کە مەڕی تیا مۆڵ ئەدری بۆ فرۆشتن، لای خۆمان پێی ئەڵێن مەیدانی مەڕفرۆشان. هەندێکیش ئەڵێن گوایە لە بنەچەدا (مقعدالشاه) بەو بوو بە (مقدشاه) ئنجا مقدیشو.

**محیط الهادی:**

ماجلانی پورتەغالی ئەم ناوەی بەسەرا بڕی لە کاتێکدا کە بە (دەربەند ـ مضیق ماجلان)دا تێپەڕی بەرەو ئەمەریکای خوارو، ئەوساتەو لەو ڕۆژەدالەو دەریاگەورەیەی کەوا هێمن و لەسەرخۆ دی بۆیە ئەو ناوەی لێنا لە کاتێکدا کە ئاوی ئەم دەریایە لە گشت دەریاکانی تر تورەتر و شەپۆلەکانی بەرزتر و هەڵساوترن.

**نوبا:**

ناوچەیەکە لە خوارووی میسر. ناوەکە ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی فیرعەونەکانی میسر بە واتای (ئاڵتون) دێت چونکە خاکەکەی لە ئاڵتوندا دەوڵەمەندە.

**کریت:**

دوورگەیەکە لە پاڵ یونانا. کاتێک کە عەرەبەکان تێچوون ناویان نا (اقریطش).

**یابان:**

یاخود جاپان: ناوەکە لە بنەچەدا بە زمانی چینی یە Jin pen واتا ڕۆژهەلات.

**سوقطره:**

یەکێکە لە پارێزگاکانی کۆماری یەمەن و (حدیبو) پێ تەختیەتی ناوەکەی لە (سوق قطره)وە هاتووە (قطره) شلاوێکە کە لە دار ودرەختەکانی جیای

## واتای ئەم ناوانە چین؟

**زهراء:**

ڕووگەش. سپی، پرشنگدار،

**رباب:**

هەوری سپی

**ربب:**

ئاوی پاك، ئاوی شیرین.

**زینب:**

دارێکی بۆنخۆشە لە عەرەبساندا.

**زمزم:**

ناوێکە نامەکەی لەبەینی سوێر و شیرینیدایە. ئاوی زەمزەمی پیرۆزیشە.

**رشوه: (رەشوە):**

ئاسك یاخود (نێرینەی ئاسك)

**رشوه: (روشوە)** برتیل.

**فاروق:**

نازناوی حەزرەتی عومەرە، کە فەرقی بەینی حەقو ناحەقی ئەکردو لەیەکی جیا ئەکردەوە.

**فراس:** شێر

**هلال:** ڕووجوان.

**طل:** سووکەباران یاخود شەونم.

**طارق:** ئەستێرەی بەرەبەیان (الطارق.. وما ادراك ما الطارق، النجم الثاقب).

**کلثوم:**

دەموچاو ئەلەر. دەموچاوپڕ (ام کلثوم: خاوەنی دەموچاوێکی تر)

**دریند:** ئەو کەسەیە دان لە دەمیانیەو (درداء: پوژنە).

**سهام: (سیهام):** کۆی (سهم)ە کە بریتیە لە (تیر).

**سهام: (سوهام):** گەرمایەکی پێ دادرپێ ئەنداز مەیە.

**سیبویە:** گەورەترین زانای (ڕێزمان) بوو. ناوی بشرکوڕی عومەر کوری حوسمانە. لە بەسرە لەدایك بووەو ساڵی ٧٧٠ز لە نزیك شیراز فەرمانی یەزدانی بە جێهێناوە. دایکی لە خۆشەویستیاپێی دوتوە (سیبویە) کە بە زمانی فارسی (بۆنی سێو) ئەگەیەنێت. چونکە منداڵێکی سوور وسپی و ڕومەتەکانی وەك سێوە لاسوورەبوون.

**سمیرامیس:**

یەکێك بوو لە شاژنەکانی دەوڵەتی ئاشوری و ناوەکە بە واتای (کۆتر) دێت.

صبا (صەبا): گەنجیەتی.

صبا (صیا): بای رۆژهەلات. (رەشەبا).

مناخ (مەناخ): ئەو شوێنەیە کە حوشتری تیا یخ ئەدری.

مناخ (موناخ): ئاوو هەوا

مسیح:

بنچینەکەی (عبری) یەو (مسیحا) یە، ئەوەی کە (پیرۆزە) یاخود پیرۆزکراوەو بە رۆن زەیت هەنویانە بۆ پیرۆزی.

یسوع:

ئەمیش بە عیبرانی (مخلص واتا رزگارکەر) دێت.

عبله: ژن لەلەو

هریره (هورەیرە)

(ابوهریرە) یەکێکە لە (هاودەم) ەکانی (پێغەمبەر. د) ناوی عەبدولرەحمان کوری صخرەو لە بنچینەدا خەڵکی (یمن) ە. هەر لە منالیەوە کە شوانی مەڕو ماڵات بووە بێچوە پشیلەی لەگەل خۆی بردوتە دەشت یاری لەگەڵ کردومو پێی رابواردوە. هەر لەبەر ئەوەیە ناونراوە (ابو هریرە) کە زوربەی بەشێکی زۆری قسەکانی (پێغەمبەر. د) بە زمان ئەوەوە ئەگێڕنەوە.

قارعة:

رۆژی زیندوکردنەوەو لێپرسینەوە (رۆژی قیامەت) (القارعە مالقارعة.. وماادراك مالقارعة).

غانیة:

ژن جوان کە هیچ پێویستیەکی بە ئارایشت نەبێ و دەست بە خۆیانە هێنێت

هیثم:

بێچووی کولارە

اخطل:

لە بنچینەدا نازناوی شاعیری ئەمەوی (غیاث التغلبی) یە اخطل بە واتای (گوێ زل) و (گوێ شۆڕ) دێت. شاعیری لوبنانیش (بشارەخوری) ئەو نازناوەی لە خۆی نا بە خۆشی ئەختەل ئەمەوی یەوە.

جعفر: رووبار

لینە: دارخورمای زۆر (پڕ بەر) یاخود دار خورمای بچووك.

احنف: شەل.

عاهل: شا. مەلیکی مەزن. هەروەها بە واتای بێوەژن (ارملە) یش دێت.

حاتم: واتا حاکم (دادپرس).

حارث: کاسبکار.

هشام: بە خاوەن دەستو دڵی فراوانو بەخشندە ئەڵێن. (پاشماوەی بۆ جارێکی تر).

• الخلاصة العربية

# اصول اسماء بعض المدن والمواقع مع شرح معاني بعض الاسماء العربية للذكور والاناث

جمال بابان

يقول الكاتب: ان ولعه بالبلدانيات دلعه باستمرار الى الجري وراء اصول اسماء المدن والمواقع لحين الوصول الى نتيجة ما في تبلور بحوثه. وعلى هذا الاساس فقد اصدر في سنة ١٩٧٦ كتاب (اصول اسماء المدن والمواقع العراقية) الذي احتوى بين دفتيه شرح اصول اسماء اكثر المدن والمواقع الكردية في كردستان العراق بالاضافة الى الاسماء العراقية الاخرى بصورة عامة. وبعد صدور الكتاب المذكور وجمع معلومات اخرى لديه بنفس المجال اعاد طبع الكتاب الانف الذكر بصورة مزيدة ومنقحة وبجزئين الاول اصول اسماء المدن والمواقع في العراق (عدا بغداد وعلاتها) وهي الاسماء التي توصل الى اصولها وقد طبع سنة ١٩٨٩. اما الجزء الثاني الخاص ببغداد وعلاتها فقد وصل الى المرحلة النهائية تقريبا الا ان احداث الحرب سنة ١٩٩١ وما رافقتها من ارتفاع اسعار الورق والطبع وغيرها حالت دون انجازها. فالقسم الاول من المقال يتطرق الى شرح اصول بعض الاسماء العربية والاجنبية وكيف بنيت وترسخت الاسماء المذكورة. اما القسم الثاني من المقال فهو خاص بشرح معاني بعض الاسماء العربية المتداولة من الذكور والاناث حيث ان معاني اكثرية الاسماء غير معروفة لدى الاكراد على الاقل بالاضافة الى بعض المتكلمين بلغة الضاد نفسها. وابسط مثال على ذلك فقليل هناك من يدري ان معنى (جعفر) هو (النهر) وان (عبله) تعني (المراة المكتنزة) ولشرح معاني البعض من تلك الاسماء تم تهيئة القسم الثاني من هذا المقال.




سەرۆکی مەزنی هێڵی جاف کەریم بەگی فەتاح بەگی بەهەشتی پاش داگیرکردنی کوردستان لەلایەن ئینگلیسەوە لە ساڵانی ١٩٢٠ ـ ١٩٢٥دا بە هۆی بڵاو بوونەوەی ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی لە بەغداو سلێمانیو دامەزرانی هەندێ قوتابخانە لە خانەقینو کفری، هەستی بەدووا کەوتنەیی هێڵی گەورەی جافو نەخوێندەواری زۆربەی گەلی کورد کردووەو داخو خەفەتی لەدڵا پەنگاوەتەوەو لەشکی قارو حەسرەت لە چاویا لەنیس ماوە بڕیاری داوە بەتۆماری ناوی هێڵەکەی لە مێژوودا خزمەتێکی بکات، هەوڵی داوە بێ یاخود بە خەیاڵێکی تری ناوی تیرەو هۆزو هێڵەکانی یادداشت کردووە، طائیفەو تیرەکانی لەگەڵ داوەو سەرژمێری ئەندامانی سوارەو پیادەی هەر هێڵێکی خستۆتە دەفتەرو مەلبەندو قەڵەمڕەوی ڕاگوزەری هەموو بەشێکی بۆ کۆچ و ڕەوی گەرمیان و کوێستان دیاری کردووەو بەرامبەر بە دەسەیارەی عەرەبی وشەی دەگەر یاوری، دوورووست کردووەو لە زاراوەی دەکۆچەری خۆماڵی لای داوە، بۆچ؟ هۆی ئەوە نادیارە! دووریش نییە ئەم ئەرکەی لەسەرەتادا لەسەر داوای لایەنێکی دەوڵەت بووبێ کە ویستوویە بزانێ سەرژمێری هێزی جاف چەندەو تاچ ڕادەیێ ئەتوانێ دەکوژدە ـ واتا ئاژاڵەنیان بەسەرا بەپێنێ . .

وادیارە کەریم بەگ لە ساڵی ١٩٣١ بە دواوە کە پەرگی بەکەمی خولاصەیەکی تەئریخی کوردو کوردستانی ئەمین زەکی بەگی بەهەشتی کەوتۆتە بەرچاو سەرنجی داوە کە ئەم مێژوونووسە کوردە لەتۆمارکردنی ناوی تیرەو هێڵەکانی کوردستانا ڕاپەڕمووە بە ڕاپۆرتەکەی میجەرسوندا، هەروا شەرەفنامەی چاپی فارسی قاهیرەی دیوە کە زۆربەیەکی بێ پەیی ناوان هێڵو هۆزو تیرەی کوردەو تەنیا ناوی جاف گەورەترین هێڵی کوردی تیا نییە لا ئەمانە هانداوە بە پەیڕەوی لەواز بەرهەمەکەی بەجۆرێکی ڕێکوپێکتر دابڕێژێ، کە خۆی و بنەماڵەکەی لێی ڕازیبن ئنجا بەخەتە زۆر جوانەکەی ڕەضابەگی نەمر چوار نوسخەی لێ هەڵگرتووە، یەکێکیان ناردووە بۆ ئەمین زەکی بەگ کە لە تەئریخی سلێمانیو ولاتیا سوودی لێ ببینێ (لاپەڕەکانی ١٧٩ ـ ١٨٦) و دوو نوسیکی ناردووە بۆ پارێزەری بەهەشتی مێژوونووس عەباس العزاوی کە لە کتێبی العشائر العراقیەدا کەڵکی لێ وەربگرێ (لاپەڕەکانی ٢٨ـ٧٦) هەروا گوێیا دانەیەکیشی ناردووە بۆ حەسەن ئەفەندی یەگ کەلە کتێبخانەکەیا بپارێزێو لەسەری بنووسێ دانەیەکیشی لە کتێبخانەکەی خۆیا بێنێتەوە.

لێرەدا بەداخەوە ئەڵێم: جگە لە تەوفیق وەهبی بەگی بەهەشتی کە لە ژیانی خۆیا کتێبخانە هەرە گرنگەکەی خۆیی بۆپارێزران داوە بە کۆڕی زانیاری، هەموو گەورە پیاوانی کوردی بەغداو جێیانی تری (ئەمین زەکی بەگ، عەلی کەمال بەگ، مەعروف جیاووک، عارف جیاووک، بنەماڵەی شێخ ڕەضای تاڵەبانی، وەهەندێ لە بنەماڵەی بابانو هەندێ لە بنەماڵەی حەیدەری و بنەماڵەی زەهاوی و بنەماڵەی سەوری و بنەماڵەی قزلجی و بنەماڵەی سەجادی هەمویان کتێبخانەکانیان وەك خۆیان بە وەجاخ کوێری پەردەیان بەسەرا کێشرا . . عەباس عەزاوی پارێزەریش کەلە تارانو ئەستەمبولو شامو میصرو جێیانی تری هەزاران کتێبی نایابی تری دەستنووسی بەدەس هێنابو کەمرد دفاضلەی کوری هەموی خستە بەردەستی دەستنووس کرانی وڵاتی سعودیەو کوێتەوە هەندێکیشی لەلایەن دراجیحە خالص، کچی بەزۆر فرۆشرا بەنامەخانەی دەستنووسی سەرەك صەدام . . بەڵام گەرچی سێ نوسخەی کتێبەکەی کەریم بەگ سەری تیاچو، باشبوو بەختی یاری بنەماڵەی جاف هاتە کارو لەبیر نوسخەکەی لای عەباس عەزاوی دۆزرایەوە، ئەویش بەهیممەتی شێخ حەمە عەلی قەرەداغی کە کتێبە دەستنووسەکانی ئەو کتێبخانەیە دەچەرد، لەکاچالسو هەواڵی کتێبەکەی گەیاند بە بنەماڵەی جاف کوڕانی داوود بەگ و کەریم بەگو ئەوانی تر زۆر پیاوانە کەوتنە خەمی و دەستی کەرەمیان بۆ شێخ درێژ کرد کە هەوڵ بدات لەم قاتیو قڕی کاغەزو گرانی خەرجی چاپیدا کتێبەکە چاپ بکات بە پێشەکییەکی لاپەڕەی خۆیو ١٠٣ لا پەڕەیی دوکتور حەسەن بەگی کەریم بەگەوە کە بە ناوی لێکۆڵینەوەو نووسینە لەسەر کتێبەکەی کەریم بەگی باوکی کە ٨٤ لاپەڕەیە و ١٢ بەشە (فەصل).

ئەم کتێبە بۆ هێڵی جافو بۆبەشێکی خاکی کوردستان هەر لە قزرابات (خورمال و ئابادی) نزیکی چیای حەمرینەوە تا ئەوپەڕی سنوری هەڵەبجەو ئاسنە، هەم مێژووەو هەم جوغرافیایە. هەڵسەنگاندنو نرخ دانانی ئەم کتێبە تەنیا شایانی کەسێکە زۆر بەوردی بیخوێنێتەوەو شارەزای هێڵەکەو وڵاتەکەی بێ، ئەوەی ڕاستی بێ ناوی کەسانو ناوی هەوارو مەڵبەندو خاك و ئاوی کە ئەم هێڵە صەدان ساڵ کردوویە بە مەیدانی هاتوچۆو جەولانگەی خۆی، لەبەرهەنگێکی جوغرافی لێ دوورووست ئەبێ، بە باوەڕی من ئەم سێ دێڕە: وطائیفەکانی جاف لە خاکی ئێرانو عیراق داوهاتنی جاف لە ئێرانو بۆ کوردستانی بابانو گەڕانەوەیان بۆ ئێرانو دووبارە هاتنەوەیان بۆ وڵاتی بابان بە دەبوایە بە ناوی ئاڵتون بنووسرایە، کەنەگونجاوە دەبوو بە چیرۆکێکی دڕشتی

ڕەشتر بوایە. ئەوەش کەمزۆر جێی ئەفسوس و داخە لەوەیە کە لاپەڕەی یەکەمی سەری لیاچووە، دەنا کەریم بەگ لەو لاپەڕەیەی بەچ ووتەگەلێکی جالاتەی پەل ڕلزاندیتەوە. .

شێخ حەمە عەلی جێی سپاسە کە ئەرکی سەرپەرشتی چاپیشی گرتۆتە ئەستۆ بەلام نەدەبو سەرقاڵی ڕۆژگار کەمتەرخەمی بکات لەگوڵە بژێری هەڵەدا بەڕاستی هەڵەی زۆری لێ کەوتووە کەلە جێی خۆیا باسی ئەکەم.

ئەو، جگە لەوە هەندێ وردە پەراوێزیشی نووسیوە بۆ ڕاست کردنەوەی هەندێ برگە، ماڵی ئاوابێ بەلام دەبو لەوەی لەبیربێ ئەوحەلە کوردی بەوجۆرە ئەنووسرا خۆزگا بیزانیایە من چ حاڵێکمە بەدەس کوردییەکەی زاتای مەزن ئەمین زەکی بەگەوە، بەلام برگەی لا ۱۲۸ «لەو سەرەدا. .» ئەوە توزکرییە «صرە»یە، واتا سەردەم. . . . بەلام خود کەریم بەگە عمانەی هەڵەیە:

۱- وەلەمشکی لاپەرە ٤٧ شەرەفنامەی فارسی لێبووە بە «باشکی» (لاپەرە ۱۳۲)

۲- هەر لە هەمان لاپەڕەی شەرەفنامەدا ناوی هارون هاتووە کەیەکێ بووە لەوعێلاتەی کورد کە پاش دەوران لەبیرێ لەسەردەمی پاشماوەی «زەنگی»دا (صەدەی شەشەم) لە «جبل السماق»ی شامەوە هاتونە لورستان، کەریم بەگ بەجالی داونە ئەلەم خۆزگا بیوتایە: «لەگەڵ جالەحان». هەروا دەربارەی «ضیالی» و«شوانکارە» «گەلالی»ش هەر لەمەی بوتایە چون «زبدة التواریخ» لەلاپەرە ۳۹۰دا نووسیویە: لەسەردەمی شاهـ عەبباسی دووەمدا ساڵی ۱۰٦۸ میرسلیمان ئەردەلان جەولانرودو عێل جالی خستۆتە ژێر دەسەلاتی صەفی سولطان گورانی میرضیاء الدینی کەبەلگەیە لەسەر ئەوەی ضیالی لەبنەرەتادا گۆرانن. .

هەروا قەلقەشەندی بەوەرگرتن لە «مسالك الابصار» لاپەرە ۲٦۱ خولاصەی ئەلرێنی کوردوکوردستان: گەلالی لەعێلەکانی گۆراتن. .

هەروا «شوانکارە»ش لە صەدەی پێنجەمدا خێوی دەوڵەتێکی بەهێز بوون لە کناری کەنداوی خەلیجەوە تا بەشێك لە لوستانی فارس (شیرازی) لێـ ـیان بەدەستەوە بووە، پایتەختیان شاری دارالعمان بو کە بەسەر چیای ئێگ موە بو، سەلجوقی ولاتەکەیان لێ داگیر کردنو ئەرتە وەرتەیان کردن، لەبیرمان نەچێ عێڵی «شوان»ی نێوان کەرکوك - پردێ بەشێ لەوان بوون بۆیە گەورەترین گوندی خۆیان ناونابو دارلەمان کە ئەکەوتە سەر ڕیگەی پردێ جگەلەمانە، هەڵەی کەریم بەگ شێخ عەبدولقادری شەهیدی ساڵی ۱۹۲۵ی لێ بوبو بە شێخ عوبەیدیللای باوکی کەلە مەدینە مردبو، پاش شۆرشی مەهابادو دوورخرانەوەی. لەم پەسن و هەڵسەنگاندنەدا ئەڵێم: پاش ئەمیر شەرەفخان هیچ کوردی دەربارەی عێلێ بالەرماندارێ والەنووسینا سەرنەکەوتووە، مەلا شەریف، ئیسماعیل، مەلا حەسەن، خەسرەو محەممەد، مەستورە خانم هەمویان لەکتێبەکانیانا تەنیا بەسەر وگوێی خاتانی ئەردەلانا هەڵئەدەن. حوسەین ناظم بەگیش لە دەفتەرەکەیا تەنیا باسی ئەمیرانی بابانو شەری نارخۆیان ئەکات ئەومێژووە نەوسانەش وەکو

حوزن و هی تری کە دەربارەی میرانی سۆرانو میرانی بەهدینان نووسیویانە، دیسانەوە هەرستایشی میرەکانە، بەلام کەریم بەگ باسی «کەرە جاف» ئەکات، باسی ملهوڕییان باسی خوارو ژووریا لەکوردستانا، لەم کتێبە باسی ڕۆڵەی کوردی ژێر دەس کەوتووە نەك میرانی زەبەردەس. . .

باینە سەر لێکۆڵینەوەکەی دوکتور حەسەنی

جاف خوا هەقە هەوڵی داوە زۆر دەنگو باسی مێژوویی کۆکردۆتە لەسەرچاوەی جۆرجۆری کوردی عەرەبی فارسی و یەکخاتەوە، بەلا گەر پرسی بەمن بکردایە ئەموت: تەنیا پێشەکییەکی کورت دەربارەی کەریم بەگی باوکی بنووسێ لەودوای زانستە مێژووییەکان بکاتە پاشکۆ نەومك لێکۆڵینەوە. جا ئەمانەشی ئەخەمە بەرچاو.

۱- لەمەوبەر نووسیوم «جاف» بەپێی بۆچوونی مینورسکی و عەزاوی بیروباوەڕی خودمن هەر جالانەکانی کۆنن کەلە سەرەتادا نزیك بەدەماو نیشتەجێ بوون و لە زۆر کتێبی مێژوویی کۆنا ناویان هاتووە، لە دەور بوەیییەکاندا (ئال بویە) کە هەرا لە نێوان سەیلەخاتونو کورەکانی دا ماوە جاوان خۆیان داوەتە پاڵ بەدری حەسەنی وەیی ئەوهێنار ئەوخاکە دابەزرانەوە نزیکبەو ڕوبارە کەبە ناوی ئەوانەوە نا جاوان رودی پەیدا کردووە، کە سەقام گیربوون هەندێکیان خوو ملوەتە کشتوکالو هەندێکیان هەر بەدەوارنشینی ماونەوە، وەکو پێشە سپای وبەدرەی حەسەنوەیی کشاون بەرەو خوارو گەیونە «دەسکەرەی ئەمرەوان»، «نەعمانیە»، «گەرگەراپا» (کوت) ولەگەڵ بەنی ئەسەد بەکۆچەری ئامەنشەلو خانەقین جەولانیان کردووە، پاشان کە عەیب لەگەڵ بەدر نێوانیان تێکچووە، بوون بە دەعبای «بوەیی»یەکان دەم بەغدلو هەلەتی ولاتەکان ژێردەستی بەدریان داوە جاوانەکان لە بەنی ئەسەد کشاونەوە بۆخوار بەغدا، لەوە دوا بە تەواوەتی لەگەڵ ئەسەدیەك کەوتوونو لەصەدەی پێنجەم بەدواوە بە هاوکاری شاری یان دوزوست کردووەو ڕەوەندە بەیەکا تێکەڵ بوون عەرەب جە شازەنگان (زەنگەنە)یان بە تیرەیێ لە بەنی ئەسەد داوەتە قەڵەم لە نیشانەی دڵپاکی و خۆ بەکەم زانینی گەلی کوردە. گوڵالەی قە ناوی تاصەدەکانی شەشەمو سەرەتای حەوتەم ناوبانگی داوەتەوە هەم بە ئازایی و هەم بە هۆی لەمیرانی جاوانو هەم بەهۆی نێکرسـ شاعیرانیانەوە (سەرنجی نامیلکەی جاوان مصطفی جەوادی بە بدەن) لە ساڵانی ٦٤٠ك بەدواوە ترکەیان نەماوە رادیارە پاش شە ئەولاکو بۆ سەربەغدا گەڕاونەوە چیاکانی کوردستان. ناوی جاواز بەرەتا «جالان» بوو عەرەب وایان زانیوە کە ناوی دووەکی (تـ سوکیان کردووە بووە بە جاف بەلگەم بۆئەم دەسکارییە ئەتەم دوایییە لەناوچەی قەرەحەسەن گوندی «جالان» ناو هەرمابو.

۳- لەلاپەرە ۱۷ نووسرابو: «. . مێژووی جاف ئەگێرنەوە بۆ ۹٤۰ لەمەوبەر» وخود د. حەسەن بەگ گاڵتەی لێهاتبو بەلام نەدەبو «

ئکتشاف تازەی درۆکان لەزاری ڕۆژنامەو گۆڤارەکانەوە بڵاو بکاتەوە لەماتەمەیەستیان هەڵەکانتن دەنگو باسی بەنرخی مێژوویی یە، ، ورقەی قۆری وەها دەربارەی ناوی ئەوروز و ناوی کاوەو شتی وەها کە (.حڵ بە کەردەوە هەیێ نووسرابوو .

٤ـ لەپەرە ١٨ نووسراوە : لە شەڕێکدا هوبەیدوللای ئەنصاری لەسیروان ئەکەونە(؟!) ئەویەرەوەو لەبنارەی شنروی نزیك بە هەڵەبجە ئەکوژرێ وەلەوێ لەنێژری کەپێی دەڵێن عەبابەیلی . . » ڕاست لەوەیە مێژونووسان هەموویان جەختن لەسەر ئەوەی داگیرکاران خانەقین حەلەوان شارەزوور سەرۆکیان جەریر، عبدالله بجلی، عزرە کوری قەیس، لەرقەمد (یالمرهمد) بوون نە عبدالله کوری هومەر نە لەبوعوبەیلەی جەراح هیچیان نەگەیونە کوردستان من لەم باسانەم زۆر باش لەکتێبی «فتوح سواد العراق»دا روون کردۆتەوەو درۆوهاش و هۆشەکان نار ئەوکتێبەم هەموو ڕاست کردۆتەوە، زۆر لەیاران پێغەمبەر (د.خ) لە شارەزوورا بەمارو دوپشك مردوون . بەڵام لەهیچ لەرهەنگێکی ناوانجا کابرای وەها تۆمار نەکراوە، لێرەدا گاڵتەیێکم هاتەبیرا لە طاوغ گوعەزێکی بچووکی قووڵ هەبو ناوی «ئیمام یەل» بو پیرەژنەکان لایان وابو یاداری لاتەیاکەکتێبی «طاوغ»م ئەنووسی چوومە لای پیرە ژنە بجموورەکە ووتم : ئەم قەبرە هی کێیە؟ ووتی هی «عبدالرزاق کوری عبدالقادری گەیلانی»یە، ووتم : تۆ حرا لطۆبت حەز لە گەیلانی ناکەی چۆن بویە بجەوری؟ ووتی : خەڵك هەموو دەچن بۆ زیارەتی ئیمام باقر و ئیمام زەین العابدین ئەیتا سوننییەکان دێنە ئێرە من لەم ناوەم بۆی دۆزیوەتەوە . پێکەنیم ووتم ئەو دووانەکەش هەروەك لەمە درۆن . ووتی : تۆ خێرت نییە تەنیا نان خەڵك لەبڕی . ئێستە ئیمامەهل گوعەزێکی سەوزو حەوشێکی گەورەی تازەی بۆکراوە .

٥ـ ناوی جاف لەکتێبی «خوداوەندی ئەلەموت دا لاپەرە ٦٧٥ هاتووە کە «پۆل ئامیزی ئەرمەنی» نووسیویەو ذەبیح اللاهـ مەنصوری وەری گێڕاوە بە فارسی : « . . . ئەرکان خاتون سەلجوقی ژنی مەلەکشاهـ کە هەمیشە خەریکی تەگبیر (مؤامرە) بو بۆ کوشتاری لەجۆرەو لەباسی مەرلێدا بۆکوشتنی حەسەن صەباح ناوی عەبدوللاهـ بەگی جاف هاتووە کە یاریدەدەری نورالدین خانی کەلوڕەبووە لە فەرمانلەیی هێزی کرماشاندا . »

گەرچی دیاریی بۆ سەرچاوە نەکردووە، ئەمە کۆنترین ناوی جافە کە ساڵانی ٤٨٠ك (١٩٠٢م) تۆمارکرابێ . من قسەکانی گروپی «یارسان» هەموو بە خەیاڵی ئەو نووسەرانە ئەزانم کە دەماودەم شتیان بیستووەو تۆماریان کردووە ئەماشای کتێبەکانیان بکە تاڵێستە هیچیان دەربارەی سەرگوزشتی سوڵتان ئیسحاق قسەیان ڕێك نییە .

٦ـ حەسەن بەگ نووسیویە « . . دایرەکە . . کچی حوسەین بەگی جلەی جاف بووە . . » . بەڵام شاهنامەی حەقیقەت لەلاپەرە ٣٢٦دا ناوەکەی جلد نووسیوە گوایە : حوسەین بەگی سەرۆکی طائفەی جەلەد کچی خۆیی داوە بە شێخ عیسای بەرزنجی کە تەمەنی ٢٠٠ ساڵ بووە . . (١٤) . » لەم لـە

پڕوپووچانەیان زۆرە .

٧ـ دەیێ عێڵ بەگی جاف کاکەیی (اهل الحق) بووبێ کە من ساڵی ١٩٤٤ پێشینییەکانی عێل بەگی م . لەگوێ و ئێوا بڵاوکردەوە کاکەییەکانی سلێمانی ـ کەرکوك ـ خانەقین زۆر شڵەژان بەوەی چۆن ئەم سرەی کاکەییەکان گەیوەتە دەست من .

٨ ـ ناوی جاف لە لاپەرەکانی ٣٩٠ زبدة التواریخ و ٣٢ لب التواریخ و ٢٣ تەئریخ ئەردەلان ئیسماعیل دا بەم جۆرە هاتووە : «سلیمان خانی ئەردەلان کەساڵی ١٠٤٦ك (١٦٣٦ز) پاش مەرگی خانئەحمەد خان یەکەم لە سەر تەختی ئەردەڵان دانیشت «صەفی سوڵتان خان گۆڕان میر ضیاء الدینی کردووە بە سەرۆکی عێڵی جاف و جوانرۆ» . .

٩ـ قانع لەو بڕوایەدایە کە جاف پاشماوەی سوارەی جەلالییەکانە لا ٢٠» . . من چاوم گێڕا بە زۆر کتێبی تەئریخ و فەرهەنگی تاوانا ناوی جەلالیی م دەس نەکەوت قانع لەکوێی هێناوە؟

١٠ـ لاپەرە ٢٤ ناوی ضیاء الدین بووە بە ضیالی و بە کوردی بووە بە صەداز ٢٢٠٠؟ نازانم حەسەن بەگ ئەم ئیملاو تەبدیلەی چۆن کردووە؟ ضیائی دەبێ بە زیالی دەبێ بەزیالی بەڵام چۆن بووە بە صەداش؟ باشتر بوو بیوتایە : دەبێ صەدانی پاشماوەی صەهابی کۆن بن بووبێ بەکورد .

١١ـ لاپەرە ٢٥ ئەوپەراویزەی «عەلی شاکر علی» هەڵەی لێ کەوتووە ڕاستییەکەی بەم جۆرەیە : «. . لای سنورەوە جەمسانو یادران دەبێ بکەوێتە لای ئێمە (عوثمانی) پشتی مەلەعجلین تا دەگاتە دەرتەنگە لەوێ سەرمیل کراوە بە سنور هەموو دەشتەکان دەبێ سەر بە ئێمە (عوثمانی) بێ، هەروا عێڵی جاف کە پێیان ئەوترێ ضیاء الدینی دەبێ بەرئێمە (عثمانی) بکەوێ، پیرەو زەردوێی بکەوێتە بەر ئەولا (ئێران) و دەبێ قەڵای زنجیری سەر شاخ وێران بکرێ، گوندەکانی لای خۆرئاوا سەر بە ئێمە (عوثمانی) بێ وگوندەکانی لای خۆرهەڵات سەر بە ئەولا (ئێران) بێت وئەو چیایانەی دیار قەڵای ظالم ی نزیك بە قەڵای شارەزوور دەبێ هی ئێمە (عوثمانی) بێ . . تاد . . » (لاپەرە ٨٧٦ تەحقیقات حدودیە دەقی پەیمان نامەی سوڵتان موراد و شاهـ صەفی بەتورکی ولاپەرە ٦٠ تەحدیداً حدود دەرویش پاشا» .

١٢ـ لاپەرە ٢٥ نووسراوە « . . بریتییە لەسێ بەش» . ئەوە هەڵەیە ڕاستییەکەی «بریتییە لە چوار بەش وەك ناوەکان، هەروا ژمارە ١٩٢٣ هەڵەیە ڕاستییەکەی ١٦٢٣ یە .

١٣ـ لاپەرە ٢٧ حەسەن بەگ نووسیویە : بەلای منەوە ئەبێ ظاهر بەگ لە ساڵی ١١٥٥ کۆچیدا هاتبێ بۆ کوردستانی عوثمانی . . » .

بەپێی ئەم هەواڵانەی دی دەبێ ظاهیر بەگ بەرلەوە لە شارەزوور بووبێ چاوەن «زبدة التواریخ» لەلاپەرە ٤٨١ باسی خان ئەحمەد خانی سێیەم دەکا کەچۆن لە ترسی نادرشاهـ ڕای کردووە بۆپاڵ دەوڵەتی عوثمانی بەڵام زۆر کورت وناوی ظاهیر بەگ نابێ . . بەڵام خەسرەو عەممەدی نووسەری لب التواریخ لاپەرە ٤٢ـ٤٥ و ئیسماعیل مەلا حوسەین لاپەرە ٢٣ تەئریخ ئەردەڵان و مەستورە خانم لەلاپەرە ٨١ تەئریخ ئەردەڵاندا هەرسێ جەختیان

لەسەر ئەوە کردووە کە خانی ئەحمەد ظاهیر بەگی جاف سالی ١١٥٥ك کوشتووە چونکە سەرپێچی کردووەو ملی بۆ فەرمانی دانەنەواندووە. بەلام سەیر لەوەیە هەر سێیان بەهاشی و هۆشێی ئەوەندە پڕ لە لالوگەزالەوە باسی خان ئەحمەد خانیان کردووە: کەچۆن ظاهیر بەگی کوشتووەو شارەزووری داگیرکردووەو کەرکوکی داگیرکردووەو موصلی داگیرکردووەو حەلەبی داگیرکردووەو چووە بۆ ئەستەنبول سولطان پێشوازی لێ کردووە قسەکانیان لەمێشکی هیچ کەسێکی خاوەن ئاوەزدا جێی نابێتەوەو تەنیا خەیالی بالای بەنگ کێش و دەبونگ ئەجێ وادیارە هەریەك قیصە خوان ئەم هەوالەی بۆگێراونەوە.

١٤- لاپەڕە ٣٤ دێر ١٧ نووسراوە: «. . . هەر مەولانا ئیدریسی بیتلیسی بیمارمێ «حصن کیف»ی دوورستکردو مەلیك خەلیل لەسەردانار بەوشێوە نەبێشت کوانوی لەبیریان کوێرەوەبێ. . » ئەم بەراوێزەی ژمارە ٢٤٢ زۆر دوورو درێژە وادیارە هەندێکی هی شەمسی ئەسکەندەوری بە. . کەئەمیش زۆر لە ڕاستیەوە دوورە. وەك لە بیرم بێ لەژمارە ٥٧ ڕەنگین دا بە ناوی «مەلاپیش هەلە ئەکا» وتارێکم دەربارەی مەلیك خەلیل نووسیو وادیارە حەسەن بەگ نەیخوێندۆتەوە باجارێکی تری ئەم باسە لەبەرەتەوە شی بکەمەوە: «. . . مەلیك سولەیمان لە پاوەمانی دەورانی چەنگیزیدا پادشای حیصن کیف بوسالی ٧٣٦ك ١٣٣٥ (زا) کۆچی دوایی کرد، ملك محمدی کوڕی لەجێی دانیشتو ساڵەها ولاتەکەی بەڕێوە برد پاش مردنی ملك عادل کوڕی لەجێی دانیشتو پەرەیدا بەخزمەتی ولات سالی ٧٨١ك ١٣٧٩/١٠ کۆچی دوایی کرد پاش ئەو ملك اشرف ی کوڕی جێی گرتەوە ولات سالی ٧٨١ك (١٣٧٩ زا) کۆچی دوایی کرد پاش ئەم پیاوە هاو دەورەی تەیموری لەنگە بو سالی ٧٩٦ك (١٣٩٣ زا) کە تەیمور پاش داگیرکردنی بەغداوتکریت ڕوی کردە ماردین ملك عادل چووەپێشوازی تەیمور زۆری ڕێزلێ ناتامردنی پادشای حصن کیف بوپاش مردنی ئەو ملك خلیل ی کوڕی جێی گرتەوە سالی ٨٢٤ك (١٤٢١ زا) کە شاهـ ڕوخی کوڕی تەیمور بۆ بەرانگاری قەرایوسف ڕوی کردە «وان» و «وسطان» ملك خلیل پێشوازی لێ کرد، لەگەل زۆر لە سەرانی کوردستان وسالی ٨٦٢ك (١٤٥٦ زا) بەرەحەتی خواچو ملك خلف ی کوڕی ملك سلیمان لەجێی دانیشت لەم سەردەمەدا حەسەنە درێژی ئاق قویونلو سەری هەلداو هێزێکی گەورەی نارد بۆ داگیرکردنی قەلاکە، بەلام سەرنەکەوتن، یەکێ لە خزمانی ملك خلف خەلەتێنرا بەوناوەی ئەیکەن بە ملك چوو لەگەرماوە ملك خلف ی کوشت بەم جۆرە حصن کیف کەوتە دەس ئاق قویونلو. (کتێبی دیار بەکریە ٢ /٣٦٦) نووسیویە: (حەسەن درێژ ملك زین العابدین و ملك ایوب ی لە خوێنی ملك خلف دا کوشت». . پاشان لە هەلێکا ملك خلیل کوڕی ملك سلیمان بەسەر تورکمانەکانی ئاق قویونلودا زال بو ولاتەکەی ئازادکرد. .

ئەمانەی شەرەفنامەو دیاربەکری یە گەواهن کە تەلا ئیدریس هیچ دەورێکی نەبووە. ئەم ملك خەلیلە لە هەلێکا بەعقوبی ئاق قویونلو بڕیاری دا بەنە مالەی حەیدەری صەفەوی تێکاو کچەکەی شاهـ حەیدەر ویستی بۆ حەجی بچێ بەسەر حصن کیف دا ملك خلیل پێشوازی کردو نەیهێشت بۆ حەج بچێ مارەی کردو شایەکی زۆر بەشکۆی کرد کە ئیسماعیل صەفەوی بوو بەپادشاهـ هەمو سەرانی کورد چوون بۆ پیرۆزبایی لەو هەموویان خستە زیندانو داوای لە ملك خلیل کرد خوشکەکەی طەلاق بدا ملك خلیل نەیکردو لە زینداناما تا لەشەری چالدێرانیدا هەمو سەرانی کورد لە زیندان ڕزگاریانبو. ڕاستە مەولانا ئیدریس دەستی هەبو بۆ دامەزراندنی فیدراسیونی کوردو سەرانی کورد لەو جۆرە هوشیاریە دوورببوونو بەقسەیان نەکرد بەلام ئەوەی کەبوتری ئەگەر مەلا ئیدریس نەبوایە دەولەتی ئەیوبی حصن کیف نەمابو ئەمەیان گومانی شەمسی ئەسکەندەری یە نەوەك من کە حەسەن بەگ وەك سەرچاوە ناوی هێناوم .

١٥- لاپەڕە ٧٣ دێر ١٥ شێخ محمد ڕەئوفـو شێخ عەلی، ئەمە دەبێ هەلەی چاپی بێ هەر مەبەست شێخ محمد ڕەئوف کوڕی شێخ عەلی بێ. هەروا «مەجید پاشای کوێی»ش دەبێ هەلەبێ مەبەست مەجید پاشای کەفری (بابان) بێ. ئەوەش کە نووسراوە لە لاپەڕە ٩٢ دا شێخ قادری شێخ پاشا ٢٢ دەبێ هەلەبێ مەبەست شێخ قادری شێخ سەعیدی حەفیدبێ کە برا بچوکی شێخ مەحمود بو.

نازانم مەلا عەلی قەرەداغی کە هەمیشە کاری لەگەل چاپو چاپەمەنیدایە چۆن ڕێی داوە ئەم کتێبە ئەوەندە هەلەی تێ بکەوێ؟ هەروا نازانم چۆن حەسەن بەگو شێخ عەلی چەندین جار وشەی «نەوە»یان لە باتی «ڕۆلە» بەکار هێناوە لەبیریان چووە شێخ مەعروفی نودەیی ئەلێت:

«نجل و ولد چی؟ ڕۆلەیە حەفیدو حافد چی؟ نەوەیە»

کەمە وەها پێشنیارم بۆحەسەن بەگ بەلکو خوا یاریدەی بدات دووبارە ئەم کتێبە چاپ بکاتەوە:

١- نووسینەکەی بکات بە پاشکۆ نەك لێکۆلینەوە.

٢- درەختی نژادی ئامادە بکات بۆ هەموو نیرینەی بەگزادە یەك لاپەڕە جێ بگرێ. .

٣- ناوی ئافرەتەکان دەخرێتە مێژو بەکارێکی گرنگە هەستان وەك خانمی وەسمان پاشا حەفصە خانمی نەقیب کوێخا نەرگسی شێوان قەرالیچەی سۆران. . تاد. .

٤- دەبوو سەرگوزشتی گەورە پیاوانی جاف بنووسێ ڕەضابەگی ئەدیبو خەط خۆش حەسەن ئەفەندی مێژو نووس طاهیر بەگی شاعیر ئەحمەد موختار بەگ حەمەمین بەگ نەبەردی نووسەرو شاعیری جوانەمەرگ جگە لەبەگزادە هەندێ پیاوی بەناوی وەك حاجی برایمی شاتری، مەلا حەمەکەریم. . تاد. .

ئیتر بەهیوام حەسەن بەگ ئەم نووسینەم بەخزمەتی ئەتریخی بزانێ نەك ڕەخنە.



# دەربارەی فێرکردنی وشەو دەستەوازەی ئینگلیزی لە قۆناغی دواناوەندیدا

د. عبدالحمید یعقوب جبرائیل
پرۆفیسۆری یاریدەدەر - کۆلێجی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین

## پێشەکی

یەك لە هۆیە سەرەکییەکانی نزم بونەوەی توانای قوتابییەکانمان لە دەرچوانی قۆناغی دواناوەندی لە زمانی ئینگلیزی نەك تەنیا لە ئاستی بەرهەمهێنانی زمان (قسەکردن و نووسینەوە) بەڵکو لە ئاستی لێگەیشتنیشدا (بیستن و خوێندنەوە) کەمیی وشەو دەستەوازەی زمانییە vocabulary و پێچەوانەی تواناییان لە رۆنانە بنچینەییەکانی رێزمان کە دیارە تا رادەیەك بەسەریاندا زاڵ بوون لە ئاکامی چالاکی دووبارەکردنەوەیەکی چڕ intensive repetition بە درێژایی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندییانەوە وگرنگترین هۆی ئەم لاوازییەش پشتگوێخستنی چالاکی فێرکردنی وشەو دەستەوازەو کەموکوری مامەڵەکردنە لەگەڵ ئەم چالاکییەکە نەك تەنیا لە کتێبی مەنهەجیدا بەڵکو لە لایەن ژمارەیەکی زۆری مامۆستاکانیشدا.

لێرەدا نووسەر لەم کەموکورییانە کە بوونەتە هۆی بەردەوامبوونی ئەم گیروگرفتە دەکۆڵێتەوەو چەند پێشنیازێك دەخاتە بەرچاو مامۆستایانی زمانی ئینگلیزی بەو هیوایەی سوودیکیان لێ وەربگرن لەو کاتەی ئەرکە قورس و پیرۆزەکەیان ئەنجامدەدەن.

## ناوەرۆك و گرنگی وشەو دەستەوازە

دانە زمانییەکان یاخود فەرهەنگییەکان، بە شێوەیەکی سەرەکی وشەکان، فۆرم form یاخود شێوەی دەربڕینی expression تایبەتی خۆیان هەیە کە بە ناوەڕۆك content یاخود واتا meaning بەستراونەتەوە. فۆرمیش کە دەکرێ بە زیاتر لە شێوەیەك بنوێنرێ، بە فۆنیمەکان دەردەبڕێ وەك Would, 'd کە چی ناوەڕۆك لە کەلتووری قسەکەرانی زمان رەنگدەداتەوە. دانەکانی فۆرم و ناوەڕۆکیش شوێنی تایبەتی خۆیان هەیە لە رستەدا، واتە دابەشبوون distribution.

دەربڕین و واتاو دابەشبوونیش لە هەر زمانێکدا شێوەو رستەی تایبەتی خۆیان هەیە. بۆ نموونە، وشەی iron (فۆرم یا دەربڕین) لە ئینگلیزیدا بە گشتی بە واتای «ئاسن» (ناوەڕۆك یا واتا) دێت. هەروەها بە واتای ئووتووش دێت (دابەش بوون)، کەچی لە کوردیدا تەنیا واتای «ئاسن» دەبەخشێت.

مەبەستمان لە وشەو دەستەوازە زمانییەکان ئەمانەی خوارەوەیە:

(١) وشەکان، وەك grin, hospital.

(٢) بەشەکانی وشە، وەك un لە untie.

(٣) دەربڕینە لێکدراوەکان، وەك The Tower of London, happy-go-llucky

(٤) دەربڕینە زاراوەییەکان idiomatic expressions وەك to be all at sea, to pull someone's legs, to look daggers at some , etc.

نزیکەی پەنجا وشەو دەستەوازەی وەك راناو pronound کاری یاریدەدەر auxiliaries هتد. ئەرکی رێزمان دەردەبڕن function words گشت وشەو دەستەوازەکانی تر، وەك ناو nouns کاری سەرەکی main verbs زۆربەی ئاوەڵناو adgectives ئاوەڵکارەکان adverbs واتای کەلتووری یاخود فەرهەنگی دەردەبڕن content words

فێربوونی وشەو دەستەوازە بێ فێربوونی داڕشتنی رستە سوودی کارەکی زۆر کەمی هەیە بەڵام لە لایەکی ترەوە زاڵبوون بەسەر بەرهەمهێنانی رستەی رێزمانی سوودێکی ئەوتۆی نییە ئەگەر قسەکەر یا نووسەر کۆگایەکی وشەو دەستەوازەی نەبێ کە لەکاتی پێویستیدا بیر و بۆچوونەکانی پێ دەربڕێ. لە راستیدا ئەو کاتەی کە بە بێ رێزمان ئەوەی دەتوانین روون کەینەوە زۆر کەمە، بە بێ وشەو دەستەوازە ناتوانین هیچ شتێك روون کەینەوە، واتە پەیوەندیگرتن بە خوێنەر... (ویلکینز ١٩٧٨ : ١١١). بڕوسکەی ئاسایی بریتییە لە تەنیا چەند وشەیەکی

لەرهەنگی بە بێ هیچ زانیارییەکی ڕێزمان، ڕیزبوونی وشەکان word order لێ دەرچێت. لەگەڵ ئەمەشدا گوێگر یا خوێنەر بە ئاسانی تێی دەگات.

پێویستە هاوسەنگییەك هەبێت لە نێوان وشەو دەستەواژە لە لایەك و ڕێزمان لە لایەکی ترەوە تەنانەت لە قۆناغە سەرەتاییەکانی فێربوونی زمانی بیانیدا. وله ڕۆشنایی تاقیکردنەوەمان لەگەڵ قوتابییە بیانییەکانماندا دەتوانین بڵێین ڕادەیەکی زۆری وشەو دەستەواژە شان بە شانی نزمترین ڕادەی ڕۆنانەکانی ڕێزمان بە زۆری تێگەیشتن لە ڕێگەی خوێندنەوەدا reading comprehension ئاسانتر دەکات لەوەی کە زانیارییەکی چاکی ڕۆنانە ڕێزمانییەکان لەگەڵ زانیارییەکی کەمی وشەو دەستەواژە دەیکات. «(مۆرسیا و رۆزێنلیك ۱۹۹۰ : ۲٤۲).

## کەمو کوڕییەکان

پشتگوێ خستنی وشەو دەستەواژە لە ئەنجامی تێڕوانینی ڕۆنانگەریی structuralism کە ئەمەش زیاتر لە سی ساڵە لە ئارادایە سەبارەت بە فێرکردنی زمانە بیانییەکان. بە گوێرەی ئەم بیر و بۆچوونە پێویستە وشەو دەستەواژە بە ئانقەست کەم بکرێنەوە بە درێژایی ئەو کاتەی کە قوتابییان خەریکی فێربوونی ڕۆنانە ڕێزمانییەکانو لایەنە سەرەکییەکانی ڕشتەی دەنگە دەبن. بەم جۆرە، فێرکردنی وشەو دەستەواژە بە ئەرکێکی ناگرنگ لە قەڵەم دەدرێت. لەبەر ئەوەی هەر لە سەرەتادا بایەخێکی کەم ئاراستەی وشەو دەستەواژە دەکرێت، ئەم هەڵوێستە هەر بەردەوام دەبێت تەنانەت لە قۆناغی دواناوەندیدا نەك تەنیا لە لایەن دانەرەکانی کتێبە ئینگلیزییەکان بەڵکو لە لایەن مامۆستاو بگرە قوتابیانیشەوە. گومانیشی تیا نییە کە ئەم کەڵەکە گەورەیەی نەبوونی وشەو دەستەواژە ترسناکترین کەمو کوڕی پرۆسەی فێرکردنی زمانی ئینگلیزییە لە قوتابخانەکانماندا و ڕەخنەیەکی تو ندە کە هەمیشە ئاراستەی شێوازی بیستن و وتن Audio- lingual Approach سەرز بە ڕێبازی ڕۆنان دەکرێت.

لە ڕۆشنایی توێژینەوەکانی ئەم دواییەدا سەبارەت بە وشەو دەستەواژەو شێوازی فێرکردنیانو بە هۆی تاقیکردنەوەم لە بواری مەشقکردنی مامۆستایانی زمانی ئینگلیزی و ئامادە بوونم لە وانەکانیاندا دەتوانم ئەم کەمو کوڕییانەی ژێرەوە دەست نیشان بکەم.

(۱) هەبوونی هەوڵدانێکی زۆر کەم بۆ دروستکردنی سیاقی واتادار Contextualization بە هەردوو جۆرییەوە مادی physical contex زمانی verbal context، واتە کە کەرەستەی زمان تەنیا بیستراو یان نووسراو بێت.

(۲) هەوڵدانێکی زۆر کەم بۆ مەشقکردن لە سەر ئەو وشەو دەستەواژانەی کە پێشتر پێشکەشکراون و چەسپاندنیان بە تایبەتی مەشقکردن لە سەر وشەی لە ڕەوتاو ڕیزمەکانیان لە ڕێگەی سیاقی جۆراوجۆر و دارشتنی وشە word formation.

(۳) دەرنەچوون لە چوارچێوەی کتێبی مەنهەجی. لەمەش دەبێتە هۆی ڕانەهێنانی قوتابییان لەسەر سیاقی ڕاستەقینە بە پەیوەندی کردنی زارەکی oral communication کە تەنیا لە شێوەی گفتوگۆو dialogue ڕۆڵنواندن role playing ئەنجام دەدرێت.

(٤) ژمارەیەکی زۆر کەمی مامۆستایان سوود لە هێمای دەموچاو facial expression جووڵاندنەوەی ئەندامانی لەش paralanguage ردەگرن بۆ ڕوونکردنەوەی وشەو دەستەواژەی دەقەکانی خوێندنەوە reading passages لە چوارچێوەی چالاکی تێگەیشتن بە خوێندنەوە.

(٥) پشت گوێ خستنی چالاکی تێگەیشتن لە ڕێگەی بیستن listening comprehension لە لایەن زۆربەی مامۆستاکان هەر چەندە ئەم چالاکییەش بەشێکی پرۆگرامی دواناوەندییە.

(٦) ڕانەهێنانی قوتابییان لەسەر خوێندنەوەی فراوان extensive reading. ئەمەش دەرنەچوونێکی زیان بەخشە لە سنووری کتێبی مەنهەجی.

(۷) ڕانەهێنانی قوتابییان لەسەر کارامەیی هەڵهێنانو inference from context هەروەها لەسەر بەکارهێنانی فەرهەنگی باش و بەسوود.

لە میانەی ئەم لێدوانەی خوارەوە سەبارەت بە وشەو دەستەواژەی چالاك و ناچالاك active vocabulary passive vocabulary وتوێژ لەسەر ئەم کەموکوڕییانە دەکەین و لە هەمان کاتیشدا چەند پێشنیازێك دەخەینە بەر چاوی مامۆستایان هێزا دەربارەی فێرکردنی وشەو دەستەواژەی زمانی ئینگلیزی.

## فێرکردنی وشەو دەستەواژەی چالاك

مەبەستمان لە زاراوەی «چالاك» وشەو دەستەواژەی بەرهەمدارە pro-ductive vocabulary، واتە ئەو وشەو دەستەواژانەی بۆ قسەکردنو نووسینەوە بەکاردەهێنرێن. سەرجەم ئەو وشەو دەستەواژانەی بۆ بیستنو خوێندنەوە سوودیان لێ وەردەگرین کۆگایەکی ناچالاك دروستدەکەن کە بە وشەو دەستەواژەی وەرگیراو ناودەبرێ receptive vocabulary. بێ گومان کۆگای وشەو دەستەواژەی چالاك زۆر لە کۆگای ناچالاك کەمترە. ئەمەش وا دەگەیەنێت کە کۆگای یەکەم بەشێکە لە کۆگای دووەم، نەك پێچەوانەی ئەمە.

دەتوانین بڵێین هەر جۆرە وشە یا دەستەواژە پێویستی بە شێوازێکی تایبەت هەیە. بەڵام دەشتوانین پشت بە شێوازێکی گشتی ببەستین بۆ فێرکردنی گشت وشەو دەستەواژەکان بەم شێوەیەی خوارەوە.

(۱) گەیاندنی واتا بە هۆی پێناسەکردن definition، نواندن dramatization، هۆیەکانی ڕوونکردنەوەی بینراو visual aids، هاوواتایی synonymy دژواتایی opposition، وەرگێڕان translation، هتد. بەڵام زۆر جار مامۆستا پەنا دەباتە بەر دوو یا زیاتر

لەم شێوازانە بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەو چەسپاندنی واتا.

(٢) دوای ئەوەی وشەیەك یا دەستەواژەیەك ڕوون دەکرێتەوە لە سیاقێکی دیاریکراودا، واتاو فۆرمی تری وشە دەخرێتە بەرچاو قوتابیان. لێرەدا مامۆستا دەبێ سەرنجی قوتابیان بۆ باوترین واتاو فۆرمە بکێشێت. ئەمەش بە پێ سیاقی نوێ ئەنجام نادرێت.

(٣) ڕاهێنانی قوتابیان لەسەر بەکارهێنانی ئەو وشەو دەستەواژەی لە چەند وانەیەکی پێشوو بەکارهێنراون لە قسەکردنو نووسینەوەدا.

ئێستاش وتوویژ لەسەر جۆرییەتی مامەڵەکردن لەگەڵ وشەو دەستەواژە لە ڕووناکی ئەم سێ قۆناغە سەرەکییە دەکەین.

## قۆناغی یەکەم

جێگەی داخە کە شێوازەکانی پێناس کردنو ناساندنو هۆیەکانی فێرکردن بیزراو پشتگوێ خراون هەرچەندە بەکارهێنانیان کارێکی لەوەندە قورس نییە. پێناسەکردن هۆیەکی کاریگەرە ئەگەر بێتو مامۆستا وشەی ئاسانتر لەوەی کە پێناسە دەکرێت بەکار بێنێت، واتە ئەو وشانەی لای قوتابیان ڕوونو ئاشکران. هەموومان دەزانین چۆن مامۆستا دەتوانێ واتای وشە لێڵەکان ڕوونکاتەوە کە ئاماژە بۆ چەند کەلو پەلو وێنە دەکات لە ماوەی چەند چرکەیەکداو هەروەها چۆن قوتابیان بەم وشەوە شارەزای واتاکان دەبن کە جار بە جار مامۆستا بە هۆی نواندنێکی سادەشێك ڕوونی دەکاتەوە.

هەر چۆنێك بێت، دۆزینەوەی واتای وشەیەك لەسەر زانینی مەدلولەکەی referent ناوەستێت، بەڵکو لەمەش گرنگتر لەکەوێتە سەر بەرچاوگرتنی ئەو هەموو پەیوەندییە جۆراوجۆر ئاڵۆزانەی نێوان وشەکان، ئەو پەیوەندییانەی کە ڕونانەکانی سیمانتیکی زمانێك دیاری دەکەنو هەروەها پەیوەندییەکانی نێوان وشەکانی دوو زمانی جیاواز. لێرەدا باسی ژمارەیەك لەم پەیوەندییانە دەکەین وەك هاوواتایی و دژواتایی و هتد.

جار بە جار هاوواتایی سوود بەخشە بۆ ڕوونکردنەوەی وشە و دەستەواژە بەڵام دەبێ لە بیری ئێمەو قوتابییەکانمان نەچێت کە لەو کاتەی دەتوانین وشەیەك بخەینە شوێنە وشەیەکی تر لە سیاقێکی دیاریکراودا، لە هەموو سیاقێکدا ئەمە کارێکی مەحاڵە. بۆ نموونە، دەتوانین وشەی glad یان pleased یان delighted لە بری وشەی happy بەکاربێنین لە ڕستەی:

**I am very happy to see you again**

کەچی ئەم ڕستانەی ژێرەوە هەڵەن:

**Glad n.w year.**

**I Wish you a pleasedent, there were four deceased.**

ئەگەر مامۆستا ڕوونکردنەوە کە the deceased تەنیا لە بواری یاسا بەکاردەهێنرێت، وەك:

**1. The deceased did not leave a Will.**

**2. The witness saw the deceased two days before his death.**

ئەم جۆرە هەڵەیە بە یەکجاری لە مێشکی قوتابیان دوور دەخرێتەوە.

جۆرێکی دژواتایی ئەوەیە کە دوو وشە بەرانبەر یەکتر دەبن بە شێوەیەك کە ڕێگە دەدرێتە پلەبوونی ڕێژەیی وەکو young old, hot cold. ئەم جۆرە پەیوەندییە بە antonymy ناسراوەو جیایە لە جۆرە پەیوەندییەکی تری وەك ئەوەی نێوان dead alive. ئەمە پێی دەوترێ تەواوکەری complementarity. لێرەدا نەرێی یەکەمیان ئەرێی دووەمیان دەگەیەنێتو پێچەوانەی ئەمەش ڕاستە. بە واتایەکی تر not alive یەکسانە بە dead کەچی not young مەرج نییە یەکسان بێت بە old چونکە ژمارەیەك پلە هەیە لە نێوان young و old. وشەی young بەراوردییەك دەگەیەنێت لەگەڵ یاخود بە پێی پێوەرێك norm. لە ڕستەی:

**He is young but he is older than his brother.**

وشەی olderئەوە ناگەیەنێت کە بکەر پیرە..

ئەم پەیوەندییە سیمانتیکییە، وەك هاوواتایی لە هەموو سیاقێکدا ئەستەمە بسەپێنرێت. بۆ نموونە dryژمارەیەك دژواتای هەیە هەرچەندە wet باوترین دژواتایەتی. بەڵام بۆ دەربڕینی دژواتای dry air قسەکەری ئینگلیز دەستەواژەی damp air بەکاردێنێت نەك Wet air* یا * moist air کەچی بۆ دەربڕینی دژواتای dry lips هەمان قسەکەر دەستەواژەی moist lipsی پێ باشترە.

جۆرێکی تری پەیوەندی سیمانتیکی کۆمەڵە وشەی گونجاوە col-location or cooccurrence. ئەمە بریتییە لەو وشانەی کە ئارەزووی کۆبوونەوەیان هەیە لە ڕستەیەکدا وەك «ئاسمان شین». لە هەر زمانێکدا ژمارەیەکی وشە بە ڕادەیەکی کەم یا زۆر پێکەوە بەکاردەهێنرێن. لە لایەکی ترەوە، وشە هەیە هەرگیز لەگەڵ وشەیەکی تر بەکارناهێنرێت یاخود ناگونجێت. بۆ نموونە، دەربڕینێکی وەك tall noise * یان * Painted noise ڕەچاوناکرێتو ئەم ڕاستییە هیچ گیروگرفتێك بۆ قوتابیان دروست ناکات. لەلایەکی ترەوە وشەو دەستەواژەی واهەیە کە لە لایەنی سیمانتیکییدا دەگونجێن بەڵام ڕێژەی کۆبوونەوەیان، واتە پێکەوە هاتنیان، لە زمانی ئینگلیزیدا یەکجار زۆر کەمە، وەك new old noises of a car engine.

بەڵام جێگەی بەدبەختییە کە بەستنەوەی ئەو وشانەی جۆرە گونجانێکی سیمانتیکییان هەیە مەرج نییە دەربڕینێکی پەسەندکراو بهێنێتە دی. بۆ نموونە، quiet و loud لە زۆر سیاقدا دژواتانو لە ئەنجامدا لەوانەیە جارێکیان قوتابی دەستەواژەی quiet noise بەکاربێنێت کەچی ئەم دەربڕینە ناپەسەندە. ڕاستە ئەم دوو وشەیە گونجانێکی سیمانتیکییان هەیە بەڵام لە هەمان کاتدا سەرچاوەی هەڵەن لە لایەن قوتابییانەوە.

ئەم کێشەیە ئاڵۆزتر دەبێت سەبارەت بە دەستەواژە زارارییەکان چونکە

واتای ئەم کۆمەڵە وشانە ناوەستێتە سەر شی کردنەوەیان بۆ بەشە کانیانەوە. بە واتایەکی تر، پێکهێنەرەکانی رستەیەك یا دەستەواژەیەك واتای گشتی ئەم رستەیە یا دەستەواژەیە ناگەیەنن. سەرنج بدە ئەم نموونانەی خوارەوە:

بە تووڕەیی سەیری دەکات to look daggers at someone

مرد Kicked the bucket

ژیانێکی ئاسانبو خۆش a bed roses

سوعبەتی لەگەڵ دەکات to pill someone 's logs

بۆ ماوەیەکی زۆر درێژ for donkev 's years

سەبارەت بە inrspect of

بۆ ئەوەی in order to

پێویستە مامۆستا بۆ قوتابیان روونبکاتەوە کە ئەم جۆرە دەستەواژانە گۆڕانکاریان لێ ناکرێت. بۆ نموونە سەبارەت بە head over heels in love ناشێ بوترێ: heels over head in love * یان

* head over heels in trouble

وشارەزاییەکی کۆمەڵە وشەی گونجاو collocations ناخۆزاراوە بن یان ئاسایی، نیشانەی کارامەیین لە زمان یاندا. (ویلکنز ١٩٧٨: ١٢٩). لە راستیدا بەکارهێنانی دەستەواژەی زاراوەیی Idioms شتێکی ئاسان نییە لە لایەن قوتابیان وکە قوتابی فێری ژمارەیەکی ئەم جۆرە دەستەواژانە دەبێت بە رێگەی لەبەرکردنی لیستەیەك لەمانە، توانای ئەوەی نابێت کە لەکاتی پێویست بە شێوەیەکی گونجاو بەکاریان بێنێت. باشترین رێگەی فێربوونیان ئەوەیە بخرێنە ناو وتووێژو dialogue مەشقیان لەسەر بکرێت.

هۆیەکی سیمانتیکی تری روونکردنەوە وەرگێڕانە. لە راستیدا وەرگێڕان لە پۆلی فێرکردنی زمانی ئینگلیزی (یان هەر زمانێکی تر) ئاکامی سەلبی دەبێت ئەگەر ئەو مامۆستا زۆر بە وردی مامەڵەی لەگەڵ نەکات. واتا ئاساییەکانی وشەیەك و واتا مەجازییەکانی لە زمانێکدا هەرگیز پراوپڕ لەم واتایانەیان نابێت لە زمانێکی تردا. دیار بە جار دەتوانین واتاکانی وشەیەکی ئینگلیزی وەرگێڕین بۆ زمانێکی تر بەڵام ژمارەیەکی زۆر کەمی وشەکانی هەردوو زمان لە هەموو واتاکانیاندا پراوپڕ دەبن. (لادۆ ١٩٦١: ٨٤). تەنانەت وشەی قەرزکراو Loan word بۆ زمانێك دەستکاری دەکرێت لە لایەن قسەکەرانی ئەم زمانەدا نەك تەنیا سەبارەت بە واتاوە بەڵکو لە داڕشتن بوونە فۆرمیشدا. وشەی chance لە زمانی کوردیدا بە «شانس» گۆڕدرێت و تەنیا واتای «بەخت» دەگەیەنێت، کەچی لە ئینگلیزیدا سەرەڕای ئەم واتایە واتای تریش دەبەخشێ وەك «رێکەوت» و «سەرپێڵ» و هتد. بۆیە لەوانەیە قسەکەری کورد لە گشت واتاکانی ئەم وشەیە نەگات کە دەیبیستێت یان دەیخوێنێت. هەروەها دووچاری هەڵە بێت کە خۆی وشەی chance بەکاردێنێت لە قسەکردن یان نووسینەوەدا.

مەبەست وا دەگەیەنێت کە لەوانەیە وشەیەکی زمانی زگماکی قوتابی هەمان واتای هەبێت وەك وشەیەکی تری زمانێکی تر لە سیاقێکی دیاری کراودا. بۆ نموونە foot یەکسان بە «پێ»، لە کوردیدا کەچی لە رووسیدا هاوواتای foot نییە. رووسەکان وشەی noga بەکاردێنن کە لاق و پێ دەگرێتەوە. بەڵام واتا مەجازییەکانی foot و پێ بە هیچ جۆرێك یەکسان نین لە ئینگلیزی و کوردیدا. سەیری ئەم وشە و دەستەواژانەی ژێرەوە بکەو واتاکانیان بەکوردی لێك بدەرەوە. ئایا وشەی «پێ» لە چەند لەم واتایانە دەردەکەوێت بەرانبەر وشەی foot؟

to have feet of clay, to put one 's best foot forward, foot-hills, foot - wear, football.

تەنیا دوا وشەیە کە وشەی «پێ» بۆ لێکدانەوەی لە کوردیدا بەکار دەهێنرێت.

هەروەها hand یەکسانە بە «دەست» بەڵام کە واتای ئەم دەستەواژانەی خوارەوە بە ئینگلیزی لێك دەدەینەوە وشەی hznd ناکەوێتە بەرچاو تەنیا لە دوا دەستەواژە نەبێت:

دەست پێ دەکات، کار بەدەست، دەست پێشخەری، دەستەواژە، دەست کورت، دەست گیران، دەست خۆش دەستدرێژی دەکات، دەستنیشان دەکات، دەستکرد..

ئەوەی دەبێتە هۆی ئاسان یان قورسی فێربوونی وشە و دەستەواژە رادەی لێکچوون و جیاوازییە لە نێوان زمانی بیانی و زمانی زگماکی قوتابیدا. لە زمانی ئەڵمانی essen و fressen یەکسانن بە eat ی ئینگلیزی، بەڵام یەکەمیان بۆ ئادەمیزادو دووەمیان بۆ ئاژەڵ بەکاردەهێنرێت. سەرەنجام، ئەم دوو وشەیە دەبنە مایەی گیروگرفت سەبارە بە قسەکەرێکی ئینگلیز. لە لایەکی ترەوە وشەی presidente ی ئیسپانی سەبارەت بە هەمان قسەکەر زۆر ئاسانە چونکە لەسەر president ی ئینگلیزی هاوچەشنن لە فۆرم و واتاو دابەش بووندا. قسەکەری ناوبراو «خاڵ» و «مام»ی کوردی پێ زەحمەتن چونکە هەردوو وشە لە ئینگلیزیدا یەکسانن بە uncle.

لە هەمان کاتدا دەبێ لە بیرمان نەچێت کە سەرچاوەی ژمارەیەکی زۆری لایەنەکانی سەلبی وەرگێڕان لە ناو پۆلدا کتێبی مەنهەجی و مامۆستان چونکە کتێبی مەنهەجی پڕە لە لیستەی وشەی وەرگێڕاو و زۆربەی مامۆستایانیش پەنا دەبەنە بەر وەرگێڕان بۆ روونکردنەوەی واتا. «هەر چەند دەکرێ وەرگێڕان چەندە دەکرێ وەرگێڕان یارمەتی قوتابی بدات بۆ تێگەیشتنی واتا لە سیاقێکی دیاری کراودا، لەبەرکردنی لیستەی وشەی وەرگێڕاو کارێکی راست نییە نەك تەنیا لەبەر ئەوەی لە مێشکی قوتابیدا هەر وشەیەك بە وشەیەکی هاوچەشنی زمانی قوتابییەکە دەبەسترێتەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەی هەر وشەیەکیش لە سیاقی سروشتی خۆیدا جیاکراوەتەوە» (ویلکینز ١٩٧٨: ١٣٠).

وەرگێڕان وتەیی کارێکی سەلبییە نەك هەر لە ئاستی وەرگرتن، واتە لە گەیشتندا، بەڵکو لە ئاستی بەرهەم هێنانیشدا. بۆ نموونە، ئەم پرۆسەیە هانی قوتابی دەدات کە رستەی وەك *Don't be tired بەکاربێنێت لە قسەکردن و نووسینەوەدا بۆ دەربڕینی وتەی «ماندوو نەبیت»، یا on my eye=

بۆ دەربڕینی دەستەواژەی (بەسەرچاو). لە کوردیدا وشەی (دەکاتەوە) سەربارى واتا سەرەکییەکەی خۆی، بۆ کردنەوەی رادیۆ و تەلەفزیۆن و هتد بەکاردەهێنرێ. لە ئاکامدا دەکرێ قوتابی ئارەزووەکی تر، تێی هەبێت بۆ دەربڕینی رستەی وەك ?Shall I open the radio* لە جیاتی Shall I sitch /turn the radio لە لایەکی ترەوە قوتابی زۆر جار دووچاری هەڵە دەبێت بەهۆی ئەوەی کە دوو وشە یاز یاتر هەمان واتایان بۆ دادەنرێت لە لایەن مامۆستا یان گەنجی مەبەجی یان فەرهەنگی دوو زمانەدا bilingual dictionary کەچی لە ئینگلیزیدا نەك تەنیا واتاکانیان بەڵکو بەکارهێنانیشیان جیاوازە. سەیری ئەم جووت وشانەی ژێرەوە بکەو دوابەدوای ئەمە سەیری رستەکان بکەو بزانە چۆن چەند هەڵەیەکی سیمانتیکیان گرتووتە خۆ:

ground/ floor, remain/ stay, reason/ cause, ago/be-fore, centre/middle, very/too, customer- client, persuade/convince.

* On entering the room, I saw a snak on the ground.
* Few figs have stayed on the tree.
* What is the reason of a sandstorm?
* She got married before two years.
* The child was in the centre of the street.
* It was very hot to play tennis.
* The grocer has many clients.
* We could not convince him to play.

سەرەنجام، ئەو بیرو بۆچوونەی کە گوایا هەر وشەیەك لە زمانی قوتابی هاوتایەکی هەیە لە زمانێکی تردا هەستێکی هەڵەیە چونکە فێربوونی زمانێکی تر بە گۆڕینەوەی کۆمەڵە ناوونیشانی زمانی قوتابی بە کۆمەڵە ناوونیشانی تری ئەو زمانە نایەتە دی. بۆیە زێدە پشتبەستن بە وەرگێڕان لەناو پۆلی فێرکردنی زمانێکی بیانیدا کارێکی ترسناکە و دەبێ دوا پەنا گا بێت کە مامۆستا سوودی لێ وەربگرێت بۆ روونکردنەوەی واتا. لە راستیدا وەرگێڕان کارامەییەکی زۆر پێشکەوتووە.

پێش ئەوەی کۆتایی بەم بەشەی باسەکەمان بهێنین سەبارەت بە قۆناغی روونکردنەوەی واتا، پێویستە ئاماژە بۆ چالاکییەکی زۆر گرنگ بکەین هەرچەندە پشتگوێ خراوە لە زۆربەی قوتابخانەکانمان دا. ئەم چالاکییەش جووڵاندنەوەی ئەندامانی لەشە لە کاتی قسەکردندا و رۆڵێکی کاریگەر دەبینێت لە روونکردنەوەی واتادا. ئەم چالاکییە سروشتییە پێش ئەوەی دەست کرد بێت چونکە دیاردەیەکی زۆر ئاسایییەو بگرە پێویستیشە لە کاتی پەیوەندی کردن بە هەر زمانێکی مرۆڤدا. (کە بە ئاسایی دەدوێین لە چوارچێوەی پرۆسەی پەیوەندی کردن سروشتی تەنیا ئۆرگانەکانی ئاخاوتن بەکارناهێنین. پرۆسەی قسەکردن بریتییە نەك تەنیا لە دەرکاندنی دەنگە زمانییەکان بەڵکو لە جووڵاندنەوەی ماسوولکەی دەم و چاو و زۆربەی ئەندامانی لەشیشدا. (ویدۆسمون ١٩٧٩: ٥٩). کە قوتابی سیاقی مادی دەبینێت شان بە شانی قسەکردنی مامۆستا، ئەم قوتابییە هەست دەکات کە فێری شتێکی راستەقینەو سوودبەخش دەبێت. ئەم شێوازە رۆڵێکی کاریگەر دەبینێت بە تایبەتی لە کاتی خوێندنەوەی بە دەنگی بەرز reading aloud لە چوارچێوەی چالاکی تێگەیشتن بە خوێندنەوە reading comprehension. سیاقی دەقێك یاخود پارچەیەکی خوێندنەوە تەنیا بە وشە دەرنابڕێت بەڵام خوێندنەوەیەکی چاك لە لایەن مامۆستاوە زۆر شت دەخاتە سەر ئەم سیاقە وەك ئاوازی دەنگ و intonation هێز و stress ئیقاع و rhythm جووڵانەوەی ئەندامانی لەش و هێمای دەم و چاو و هتد. بێ گومان ئەمانەش دەبنە هۆی تێگەیشتنی باشتری قوتابییان.

تا ئێستا خەریکی وتوێژکردن بووین دەربارەی روونکردنەوەی واتا لە رۆشنایی پەیوەندییەکانی سیمانتیکی نێوان وشەو دەستەواژە چ لە چوارچێوەی زمانی ئینگلیزی چ لە نێوان ئەم زمانەو زمانی قوتابیدا. بێ گومان واتا لەم قۆناغەدا بە گشتی لە رێگەی ئەو سیاقە دیاری دەکرێ کە وشەیەك یا دەستەواژەیەکی گرتبێتە خۆ. هەروەها وتمان مامۆستا پەنا دەباتە بەر جۆرەها شێواز بۆ روون کردنەوەی واتا لە رێگەی پێناسەکردن و نواندن و وەرگێڕان و هتد.

با بزانین، بۆ نموونە، مامۆستا چۆن مامەڵە لەگەڵ وشەی hard دەکات لە hard material لێرەدا مامۆستا دەتوانێ دەست بە شتێکی رەقی وەك تەباشیر بنێت و بڵێت:

**Chalk is hard. material.**

دوا بە دوای ئەمە دەست بە شتێکی نەرمی وەك پارچە ئیسفەنجێك یان شانی چاکەتەکەی دەنێت و دەڵێت:

**Sponge is soft**

سەبارەت بەم نموونەیە مامۆستا هیچ پێویستی بە وەرگێڕان یان هاوواتایی یان پێناسەکردن نییە. ئنجا مامۆستا رادەی تێگەیشتنی قوتابییان تاقی دەکاتەوە بە هۆی چەند پرسیارێکەوە لێرەدا قوتابی، دوای ئەوەی تا ئێستا تەنیا گوێگرو بینەر بووە، دەست بە بەشداری دەکات لە پرۆسەی روونکردنەوەی واتا لە رێگەی وەڵام دانەوەی پرسیارەکاندا، بۆ نموونە:

**Is Wood soft? What abut stone? What other things are hard?**

لە قۆناغی دووەمدا، قۆناغی مەشقکردن لەسەر واتاو فۆرمە بنچینەکانی تری وشە لە چوارچێوەی سیاقی گونجاودا، قوتابی زانیارییەکی تر وەدەست دێنێت بۆ ئەوەی بتوانێ لە قۆناغێکی دواتردا، قۆناغی بەرهەم هێنان، وشەو دەستەواژەی گونجاو لە کاتی پێویست بەکاربێنێت.

## قۆناغی دووەم

زۆربەی وشە و دەستەواژەی چالاکی قوتابی زیاتر لە واتایەک دەبەخشن و وەدەست هێنانی زانیارییەکی پێویست دەربارەی واتا جۆراوجۆرەکانی وشە تەنیا بە ڕێگەی سیاقی دیاریکراو دێتە دی. پێش ئەوەی چەند نموونەیەک بخەینە ڕوو بە پێویستی دەزانین باسی ناوەرۆک و گرنگی سیاق لە دیاریکردنی واتا بکەین.

وەکو پەڵی ڕاستەقینە و realia هۆیەکانی ڕوونکردنەوەی پێنراو، قوتابی بە تەنیا یەک واتای وشە یا دەستەواژە دەناسێنێت بەڵام وەدەست هێنانی شارەزایی دەربارەی فرەواتایی ژمارەیەکی زۆری وشەکان لە ڕێگەی سیاق نەبێ ناکرێ چونکە واتای ڕاستەقینەی وشەیەک لەسەر بنەمای پەیوەندییە ئاڵۆزەکانی لەگەڵ وشەی تری سیاقدا دەستنیشان دەکرێت. (ویلکینز ١٩٧٨ : ١٢٦). ئەمە سەبارەت بە زانینی واتا. بەڵام بۆ ئەوەی قوتابییان بتوانن مامەڵەیەکی سوودبەخش لەگەڵ وشە و دەستەواژە بکەن لە هەر دوو ئاستی تێگەیشتن و بەرهەمهێناندا، دەبێ پەنا بەرینە بەر سیاقەوە، نەک فێری چەند لیستە وشەی مردوویان بکەین. ئێمە ئامانجمان قوتابییەکانمان تەنیا ڕاستییەک بزانن دەربارەی وشەکان. دەمانەوێ قوتابییان بتوانن بە شێوەیەکی گونجاو وشەکان بەکاربێنن. ئەمەش بەبێ مەشق کردن ناو سیاق ناکرێ (برایتو ماک گریگور ١٩٧٦ : ١٧). زمان تەنیا کۆمەڵە وشە و دەستەواژە نییە کە هەر یەکەیان واتای دیاریکراو و جەسپاوی هەبێت.

زمان ئۆرگانیزمێکی چالاکە و پارچەکانی (وشە و دەستەواژە) کار لە دراوسێیەکانیان دەکەن و لە هەمان کاتدا دراوسێیەکانیشیان کاریان لێ دەکەن. بە واتایەکی تر، ئەو وشەی لە دەوروبەری سروشتی خۆی جیا بوویتەوە ڕەمزێکی لێڵە و هەر کە دەچێتە ناو سیاقێکی دیاریکراو زۆر لە واتا ڕەچاوکراوەکانی فەرامۆش دەکرێن و تەنیا تاکە واتایە دەمێنێت.

سەبارەت بە سیاقی زمان verbal contex وەک پێستی ڕادیۆ و خوێندنەوە، واتا بە هۆی کۆمەڵە وشەی گونجاو collocation لە دەوروبەرێکی زماندا، سەرنج بدە چۆن واتای stop دەگۆڕێ بە گۆڕانی دەوروبەرەکەی.

Stop the thief.

The policeman stopped the fight.

When will you stop working¿.

He stopped my wages.

The clock has stopped.

What about a stop for food?

They came th a full stop.

.........etc.

لێرەدا واتای stop بە هۆی وشەکانی تری ڕستە دەستنیشان دەکرێ. لە لایەکی ترەوە stop بە وشەیەکی لێڵ ambiguous لە قەڵەم دەدرێت لە ڕستەی Stop it! بەبێ سیاقێکی مادی physical context، بۆ نموونە کە ئەم ڕستەیە لە لایەن دایکێک بوترێ بۆ ڕاگرتنی گریانی منداڵەکەی، یان بۆ ڕاگرتنی شەڕی نێوان دوو کەس یان بۆ وەستاندنی ئۆتۆمبێلێک لە لایەن شوفێرەوە.

ڕوونکردنەوەی دەربڕینێک زۆر جار پێویستی بە دروستکردنی سیاقێک دەبێت بۆ نەهێشتنی لێڵی. سەبارەت بە فێرکردنی واتا. لە ڕاستی ڕستەیەکی ڕوونی وەک .that spring was beautiful واتایەکی دیاریکراو نابەخشێت ئەگەر پێشتر نەخرێتە ناو سیاقێکی مادییەوە. سەرنج بدە چۆن گۆڕینەوەی سیاق واتای جیاواز وەدەست دێنێت لەم ڕستانەی ژێرەوە:

That spring I took no courses.

That spring waters a large area.

That spring needs repairing.

ئێستاش دووبارە باسی hard دەکەین تاوەکو بزانین چۆن مامۆستا مامەڵەی لەگەڵ دەکات لەم قۆناغەدا. لێرەدا مامۆستا قوتابییان بە باوترین واتای وشە یا دەستەواژەی ژێر تۆژینەوە دەناسێنێت لە چوارچێوەی چەسپاندنی وشە و دەستەواژەی چالاکی لە ڕێگەی ئاڵوگۆڕکردن لە نێوان مامۆستا و قوتابییان دا. ڕاهێنان لەو واتایانە لە چوارچێوەی مادی و زمانی ئەنجام دەدرێ. بۆ نموونە:

teacher: Is mathematics easy or difficult¿

Student: Difficult, sir.

Teacher: Right you are. It's a hard subject.

ئاشکرایە کە ئەم واتایەی hard جیایە لەو واتاکەی یەکەمی ئەم وشەیە. دوای ئەمە مامۆستا دەتوانێ باسی واتایەکی تری hard بکات:

Teachar: Do you like your father, Azad?

Azad: Yes, I do.

Teacher: What about you, Aso?

Aso: Er... I dont't, sir.

Teacher: Oh, Why?

Aso: He baets me.

Teacher: You mean he's rather severe... hard..

Aso: Yes, sir.

بەم جۆرە مامۆستا دەتوانێ لێرەدا بەردەوام بێت یان بەردەوام بێت لە ئاستی

. قوتابیان بە واتای بنچینەی تری وشە .

لەم قۆناغەدا مامۆستا هەڵێك ئەرەخسێنێ بۆ بە کارهێنانی وشەکە لە سیاقێکی زاراوەیدا . بۆ نموونە ، ڕوونکردنەوەی یەکێك یا زیاتر لەم دەستەواژانەی خوارەوە :

**to rake a hard line, hard of hearing, as hard as snalls,**
**hrad and fast rules, to drive a hard bargaing,... etc..**

دوای ئەوەی قوتابیان فێری واتای وشەیەك دەبن ، چەند فۆرمێکی سوودبەخش پێشکەش دەکرێ . بۆ نموونە ، لێرەدا تاییبەتنا **hard** بە ئاوەڵناو هاتووە . مامۆستا لەکاتی پێویست (مەرجیش نییە لە هەمان وانەدا) باسی بەشەکانی ئاخاوتنی **parts of speech** تری **hard** دەکات وەك ئاوەڵکار و کار و ناو ئەگەر پێشتر مامۆستا پێشکەشیان نەکردبێت . بەڵام باشتر وایە مامۆستا هەمیشە دوورکەوێتەوە لە فەرمداڕشتنی فۆرمەکانی وشە بە تایبەتە فۆرمە نائاوەکان چونکە ئەمە دەبێتە مایەی سەرلێشێوانی قوتابیان . لە لایەکی ترەوە فرە ڕوونکردنەوەو فرە پرسیار گلێنی کۆشش بە فیڕۆ دەبات .

ئەگەر فۆرمەکان لە هەمان بەشی ئاخاوتن بن بە ئاسایی واتای جیاوازیان دەبێت و پێویستە لەم جیاوازییە ڕوون بکرێتەوە . بۆ نموونە :

**continuous/ continual, historic/ historical, economic/ economical**

لە ڕاستیدا ڕوونکردنەوەی واتا تەنیا بەشێکی پرۆسەی فێرکردنی وشەو دەستەواژەیە . وەدەستهێنانی وشەو دەستەواژەی چالاك لەسەر مەشقکردنێکی ڕێكوپێكو درێژخایەن دەوەستێت . لە قسەکردنو پێستندا (مەبەستمان لە پێستن هەوڵی تێگەیشتنە لە کاتی گوێ ڕاگرتن) .

بۆیە دەبێ بایەخێکی ورد بدرێتە چۆنیەتی بەکارهێنانی وشە نەك تەنیا ڕوونکردنەوەی واتاکەی ، (لادۆ ١٩٦١ : ١٢٠) . بەم جۆرە ، ئێستاش دەچینە قۆناغێکی نوێ کە قۆناغی سێیەمی فێرکردنی وشەو دەستەواژەیە .

## قۆناغی سێیەم

گرنگترین و کاریگەرترین شێوازی پەرەپێدانی توانای زاڵبوون بەسەر بەکارهێنانی **role playing** چونکە زمان لە بنچینەدا بریتییە لە قسەکردن لە چوارچێوەی پەیوەندی کردنی زارەکیدا ، شانبەشان ڕۆڵ نواندن دارشتنی کورت دێت ئاخۆ ئەمە زارەکی بێت یا نووسراو .

دوای ئەوەی مامۆستا ناوە ناوە هەست دەکات کە قوتابیان کۆگایەکی گونجاوی وشەو دەستە واژەی چالاکیان وەدەستهێناوە کە دەتوانن وتووێژێك بنوێنن یان ڕاپۆرتێکی کورت پێشکەش بکەن ، لەو کاتەدا مامۆستا دەبێ هەرگیز دوودڵ نەبێت بۆ ئامادەکردنی بارو دۆخی گونجاو بۆ ئەنجامدانی ئەم چالاکییە بە پێی ئەو کاتەی بۆ ئەم مەبەستە دەرخستێت .

لە ڕاستیدا ، ئەنجامدانی ئەم هەنگاوە (دڵنیین هەنگاوە لەبەر ئەوەی دەبێ مامۆستا لێرەدا ئەختێك لە سنووری کتێبی مەنهەجی سەپێنراو دەرچێت) ئاسان نییەو لە ئاکامدا پشتگوێ خراوە . لە ڕۆڵنواندندا قوتابیان لەسەر ئەو وشەو دەستەواژانە مەشق دەکەن کە پێشتر بە جۆری مەشقیان لەسەر کراوە ، بەڵام بە شێوەیەکی تر ، واتە بە شێوەیەك کە لاسایی دیمەنێکی ژیانی ڕاستەقینەی ڕۆژانە بکات . ئەمەش پێویستی بە ئامادەکردنی کۆمەڵێ لە دەربڕینی گونجاو هەیە کە قسەکەرەکان بەکاریان دێنن بۆ پەیوەندی کردن دەربارەی ڕووداوێك یا کێشەیەکی دیاریکراو .

بۆ ئەوەی قوتابیان بە شێوەیەکی چاکتر ڕۆڵی خۆیان ئەنجام بدەن باشتر وایە مامۆستا بە کورتی چۆنیەتی ڕەفتارکردنیان بۆ ڕوون بکاتەوە . سەرنج بدە ئەم نموونەی ژێرەوە :

نیازت وایە دوو شەو لە مێوانخانەیەکدا بخەویت . لە سەرەتادا ئامانجی سەردانەکەت ڕوون دەکەیتەوە بۆ بەڕێوەبەری مێوانخانەکە . بەڕێوەبەر ژوورێکت پێشکەش دەکات لە نهۆمی دووەمدا . دوابەدوای ئەمە داوای زانیاری دەکەیت دەربارەی کرێی ژوورەکەو ئامادەیی خۆت دەردەبڕیت سەبارەت بەم کرێیە . لە کۆتاییدا بەڕێوەبەر داوای ناسنامەو ئیمزات لێ دەکات و کلیلی ژوورەکەت دەداتە دەست . ئەمانەش چەند وشەو دەستەواژەن کە ڕۆڵنوێنەرەکان پێویستیان پێ دەبێت و باشتر وایە مامۆستا بیانخاتە سەر تەختەی ڕەش :

**..... evening, single room, vacant, second floor, price, including/ excluding service, sign, register, keys.....**

لە ڕێگەی مەشقکردنێکی پلەدار و دووبارەکراودا ژمارەیەکی زۆری قوتابیان دەتوانن بەرێکوپێکی پەیوەندی بە یەکتر بکەن وەك ئەم نموونەی خوارەوە :

**A** Good evening.
**B** Good evenimg.
**A** I'd like a single room for two nights.
**B** Let me see.
**A** What's the price?
**B** £50 a night excluding service.
**A** OK. I'll have it.
**B** Will you sign the register, please?
**A** Certainly.
**B** Here are the keys.
**A** Thank you.

لەم جۆرە چالاکییە سیاقی نیمچە سەر وشەی داپن دەکەنو لێرەدا قوتابییان دەتوانن لەسەر وشەو دەستەواژەی نوێو کۆن مەشق بکەن. گرنگی ئەم چالاکییەش لەوەیە کە وشەو دەستەواژە لە سیاقی راستەقینەیان هیچە راستەقینەدا مەشقیان لەسەر دەکرێت.

لێرەدا پێویستە لە بیرمان نەچێت کە وشەو دەستەواژەی چالاك تەنیا وشەی ئاسایی ناگرێتەوە، بەڵکو دەربڕینە زاراوییەکانیش دەگرێتەوەو ئەمانەش رۆڵێکی کاریگەریان لە پەیوەندیکردنی زارەکی نارەسمی -in formal oral communication هەیە. بۆیە باشترین شێواز ئەوەیە بخرێنە ناو وتووێژەوە چونکە بەپێی سیاق روونکردنەوەیان زۆر زەحمەتە. مامۆستا ناتوانێ دەستەواژەی وەك run somebody back یان drop somebody off بۆ قوتابییان روونبکاتەوە بەبێ وتووێژێکی وەك ئەمەی ژێرەوە بە مەرجێك ئەم وتووێژە لە یەك وانەدا بەڵکو لە سێ چوار وانەی داهاتووشدا:

A Sorry, but I missed that.
B I said, I 'll run you back in the car.
A Isn 't it too much trouble?
B No, it won 't take a minute to drop you off.

ئەمەی ژێرەوەش نموونەیەکی تری مەشقکردنە لەسەر هەمان جۆر دەستەواژە:

... to be off, to go down with sometiong, to pass something on..
A How 's your father?
B He 's been off for a day or two
A What 's wrong with him?
B He 's gone down with a cold.
A I hope he 'll soon get better.
B Thanks. I 'll pass it on.

شایانی وتنە ئەم جۆرە راهێنانە پێویستی بە سەربەرشتیو یارمەتیدانی بەشدار بوونی بەردەوامی مامۆستا دەبێت.

لە لایەکی ترەوە دەبێ لە بیرمان نەچێت قوتابی پێویستی بە فێربوونو مەشقکردن لەسەر ژمارەیەك واتاکانی چەند کاری باو هەیە چونکە زاڵ بوون بەسەر واتا سەرەکییەکانی ئەم وشانە بەشێکی بنچی گرنگترین وشەو دەستەواژە دەنوێنێت. سەیری ئەم نموونەی خوارەوە بکە:

Look here! to look blue to look down on
to look forward to to look up to to look after, etc.

بێ گومان زاڵبوون بەسەر ئەم جۆرە واتایانە کەلەنێکی گەورە دروست دەکات لە کۆگای وشەو دەستەواژەی قوتابییەکانمان لە قۆناغی دوا ناوەندی و هەروەها لە قۆناغی پێشکەوتوودا.

لە کۆتایی ئەم بەشەی باسەکەماندا دەربارەی قۆناغی دووەمەوە چەند جۆرە راهێنانێك پێشنیاز دەکەین بۆ پەرەپێدانو فراوانکردنەوەی کۆگای وشەو دەستەواژە:

(١) لەم خشتەیەی خوارەوە بە چاکی بخوێنەرەوەو چەند رستەیەك دابڕێژە بە مە... هەر رستەیەك دوو وشە یا دەستەواژەی ئەم نەخشەیە بگرێتە خۆ؛ بۆ نموونە:

Iraq is situated in Asia. I missed the bus

| float | miss | two hours | temperature |
|---|---|---|---|
| hospital | fire | wood | Iraq |
| Asia | discover | . journey | bad master |
| thermome-ter | captain | treatment | lunch |
| one oc'lock | team | Columbus | bus |

(٢) لەم بۆشاییانەی ژێرەوە بە وشەیەکی گونجاوی ئەم لیستەیە پڕ بکەرەوە:

heavy, brave, fresh, ugly, true

(a) This morning, I feel as...... as a daisy.
(b) It feels as..... as lead.
(c) She is as...... as sin.
(d) He is as...... as steel.
(e) He is as.... as a lion.

(٣) وشەیەك لە لیستەی دەستە چەپو یەکێکی تر لە لیستەی دەستەراست بەکاربێنە بۆ دارشتنی چەند رستەیەك دەربارەی دەنگەکانی ئاژەڵ؛ بۆ نموونە:

Dogs bark.
Dogs roar
Shakes bleat
Cows hiss
Sheep bark
Cocks moo

Wolves howl
Lions crow

(٤) چۆن داوای ئەم کەلو پەلانەی ژێرەوە لە فرۆشگاکاندا دەکەیت؟ بۆ نموونە:

I'd like a kilo of tomatoes.
Potatoes bunld
matches bunch
flowers kilo
shoes box
pins packet
firewood pair

ئەم جۆرە راهێنانانە تایبەتن بە کۆمەڵە وشەی گونجاو cooccurrence. مامۆستا دەتوانێ راهێنانی تر ئامادە بکات سەبارەت بە پەیوەندییە سیمانتیکییەکانی تری نێوان وشەو دەستەواژە.

## فێرکردنی وشەو دەستەواژەی ناچالاك

قسەکەری ئینگلیز نزیکەی دوو هەزار وشە بەکاردێنێت بۆ پەیوەندیکردنی زارەکی رۆژانە. بەڵام کۆگای وشەکانی لە ئاستی خوێندنەوەو بیستن بەکجار فراوانە. ئەگەر ریستمان بەرە بە توانای قوتابییان لە تێگەیشتنی چاکی کەرەسەی وتراوو نووسراو بدەین، دەبێ کۆگا ناچالاکییەکەیان فراوان بکەین. ئەمەش لە دوو سەرچاوەوە دێت. یەکەم خوێندنەوەی فراوان extensive reading. دووەمیان گەیشتن بە بیستن listeing comorehension.

مەبەستمان لە خوێندنەوەی فراوان ئەوەیە قوتابی لە سنووری کتێبی مەنهەجی تایبەت بە خوێندنەوە لە قۆناغی دواناوەندی دەرچێت. بە واتایەکی تر، مامۆستا پرۆگرامێکی رێکوپێکی خوێندنەوەی دەرەوەی پۆلی خوێندن دابنێت کە قوتابی بتوانێ ناوە ناوە شتێك لە کتێبخانەی قوتابخانە یان لە ماڵەوەدا بخوێنێت. ئەمەش پێویستی بە دابینکردنی ژمارەیەکی گونجاوی کتێبی جۆراوجۆر هەیە. بێ گومان لەم قۆناغەدا قوتابی هەر توانای ئەوەی هەیە کە سوود لە سێ جۆر کتێب وەربگرێت: کتێبی ئاسان کراوو simplified کتێبی کورت ـ کراوو ئاسانکراوو abridged and simplified کتێبی کورتکراو. abridged.

ئەم چالاکییە تەنیا کۆگای وشەو دەستەواژەی قوتابی زیاد ناکات بەڵکو قوتابی کاتێکی خۆشیشی لەگەڵدا بەسەردەبات. وە لە رێگەی خوێندنەوەی فراوان قوتابی ئەم راستییە دەدۆزێتەوە کە وشەو دەستەواژەی زمانی زگماك پڕ بە وشەو دەستەواژەی زمانێکی بیانی نین و لە هەمان کاتدا وردە وردە شارەزای ئەو واتایانە دەبێت کە وشەکان بە قسەکەری ئەم زمانە بیانییە دەگەیەنن چونکە وشەکان لە سیاقی سروشتی خۆیانەوە بەکارهێنراون. لە لایەکی ترەوە پەیوەندی نێوان قوتابی و زمانی بیانی نووسراو بەتایبەتی کە ئەم کەرەستە زمانییە بە چەندین شێوازو بۆ جۆرەهای مەبەست نووسرابێت دەبێتە مایەی شارەزاییەکی پتەوتری قوتابی سەبارەت بە زۆربەی زۆری ئەو دەربڕینە ئاساییانەی قسەکەری بیانی بەکاریان دەهێنێت. (ویلکنیز ١٩٧٨ : ١٣٢).

ئایا ئەم چالاکییە گرنگە لە قوتابخانەکانماندا ئەنجام دەدرێت؟ بە داخەوە نەخێر! ئەم گیروگرفتە ئاڵۆزتر دەبێت کاتێ بیر لەو راستییە تاڵە دەکەینەوە کە ژمارەیەکی زۆری مامۆستایان نەك تەنیا ئەم چالاکییە بەڵکو تەنانەت کتێبە مەنهەجییەکان تایبەت بە خوێندنەوەشیان readers خستوەتە پشتگوێ بەتایبەتی کتێبەکانی سەر بە پۆلی چوارەم و پێنجەمی دواناوەندی چونکە تەنیا کتێبی پۆلی شەشەم The Merchant of Venice داواکراوێکی تاقیکردنەوەکانی وەزارییە.

بەرهەمی خوێندنەوەی فراوان زۆر باشتر دەبێت ئەگەر مامۆستا قوتابییان لەم سێ کارامەییەی ژێرەوە رابهێنێت.

(١) دارشتنی وشە Word formation

(٢) هەڵێنان inference، واتە هەوڵی دۆزینەوەی واتا لە رێگەی سیاقی زمانی یان دەوروبەری زمانی وشە یان دەستەواژەدا.

(٣) بەکارهێنانی فەرهەنگی تاك زمان monolingual dictionary گونجاو.

شێوازێکی بەرهەمداری دارشتنی وشە بەکارهێنانی پێشگرو پاشگرانە affixation. تاوە ناوە مامۆستا پێشگر prefix یان پاشگر suffix هەڵدەبژێرێت و داوا لە قوتابییان دەکات چەند نموونەیەك بهێنن وەك زیادکردنی ment بۆ .argue, assign, manage, etc یان -un بۆ .tie fold, happy, believable, etc، یان - less بۆ ,care .home, money, etc.

لێرەدا ئاشکرایە نموونەی یەکەم دارشتنی ناوە noum نموونەی دووەم بەکارهێنانی -un بۆ گەیاندنی پێچەوانەی کارو verb ئاوەڵناو دەگەیەنێت. بە هۆی ئەم جۆرە راهێنانە قوتابی توانایەکی پتر وەدەست دێنێت بۆ دۆزینەوەی واتا سەبارەت بە سیاقێکی دیاریکراوەوە.

شایانی سەرنجە ئەم جۆرە مەشقکردنە بە چالاکییەکی سەربەخۆ لە قەڵەم نادرێت چونکە لە میانەی چالاکی سەرەکییەکاندا ئەنجام دەدرێت و درێژترین مەشقکردن تەنیا نزیکەی سێ دەقیقە دەخایەنێ. جگە لەوەی کە ئەم کورتە چالاکییانە قوتابییان بە وشەی نوێ دەناسێنن لە هەمان کاتدا هۆی وەبیرخستنی ئەو دەربڕینانەن کە قوتابییان ماوەیەکە بەکاریان نەهێناوە یان نەیانبیستووە.

لە خوێندنەوەی فراواندا ئەگەر قوتابی واتای چەند وشەیەك نەزانێ،

پێویست ناکات گەشتێکی دوورودرێژ بکاتە ناو فەرهەنگ. خوێنەری اسایی پێویستی بە فەرهەنگ دەبێت تەنیا ئەگەر نەزانێ واتای وشەیەك یە هۆی ڕێنەگەیشتنی تەواوی دەقێك یان پارچە نووسراوێك. ئەمەش ادەگەیەنێ کە قوتابی دەبێ لەسەر هەڵێنان واتا لە ڕۆشنایی سیاقدا ابهێنرێت. ئەم کارامەییەش زۆر گرنگە چونکە دەبێتە هۆی پاشەکەوت ردنی کاتێکی بەنرخ و کۆششێکی زۆر لە ئاکامی کەمبوونەوەی پەنابردنە ەر فەرهەنگ.

بۆ ئەم مەبەستەش مامۆستای دڵسۆز ناوە ناوە کەرەستەیەکی خوێندنەوە ەستنیشاندەکات بۆ مەشق کردن لەسەر هەڵێنان واتا. لێرەدا قوتابی هەوڵی دۆزینەوەی واتا شاراوەکان دەربڕێنێك دەدات. تاقی کردنەوەی ئەم توانایەش چەند پرسیارێك دەگرێتە خۆ کە وەڵامێکی ڕاستەوخۆیان ئاشکرا یان نەبێت لەناو دەقێك یان پارچە نووسراوێکدا.

گریمان قوتابی ئەم ڕستەی خوێندەوە:

**Water vapour and other gases were trapped in the hot material of the young earth.**

لێرەدا مامۆستا دەتوانێ داوا لە قوتابییان بکات ئەم ڕستەی خوارەوە تەواو بکەن و بۆ ئەم مەبەستەش یەکێ لەو وشانەی لەژێریا دان هەڵبژێرن:

**Water vapour is a....**

**(liquid, gas, solid)**

ئەمەش نموونەیەکی ترە:

**Going on a journey is very pleasant, but I like to go by myseflf.**

**I can enjoy society in a room but out of doors nature is company enough for me.**

لێرەدا مامۆستا دەتوانێ ئەم پرسیارە ئامادە بکات:

**The writer can engoy the company of other people.......**

**(a) When he has a walk.**

**(b) when he goes on a gourney.**

**(c) When he stays indoors.**

هەرچەندە خاڵی سێیەم (c) بە دەقی ئێستای ناکەوێتە بەرچاو لەم پارچەی سەرەوەدا ژمارەیەك هۆمان بەدەستەوەیە کە ئەمە وەڵامە ڕاستەکەیە.

هەروەها مامۆستا دەتوانێ جار بە جار چەند ڕاهێنانێکی هاوچەشن ئامادە بکات لە چەند دەقێکی ئینگلیزی یا چەند دەقێکی وەرگێڕاوی بابەتە مەنهەجییەکانی قوتابی.

وتانێ گرنگی و سوودی فەرهەنگ بێتە هۆی دوورخستنی گرنگی و سوودی پتری هەڵێنان لە مێشکی قوتابییدا. تەنانەت ئەگەر قوتابی بڕیاری دابێت بە دوای واتای وشەیەك یا دەستەواژەیەك بگەڕێت لە ناو فەرهەنگدا پێویستە هەنگاوی بەدەمی هەڵێنان بێت. (برایتو مالگربگور ١٩٧٦ : ٣٨).

هەرچۆنێك بێت ئەم جۆرە بۆچوونە گرنگی فەرهەنگ کەم ناکاتەوە و مامۆستای لێهاتوو کاتێکی گونجاو بەسەردەبات بۆ چۆنیەتی بەکارهێنانی فەرهەنگ و سوودوەرگرتن لەو هەموو زانیارییانەی کە تایبەتن و شایانی وەبیرهێنانە کە باشترین فەرهەنگ فەرهەنگی ئینگلیزی - ئینگلیزییە سەبارەت بە فێربوونی ئەم زمانە بیانییە.

لە لایەکی ترەوە زنجیرەیەکی ڕێکوپێکی چەند ڕاهێنانێکی تێگەیشتن بە پێی هەنگاوێکی زۆر گرنگی بگرە پێویستیی پرۆسەی پاڵپشتی کردنی چالاکی خوێندنەوەی فراوانە، بەڵام جێگەی داخە کە ئەم چالاکییە بە تەواوی پشتگوێ خراوە لە لایەن زۆربەی زۆری مامۆستایان. سەیر لەوەیە هەندێك لە مامۆستایانی زمانی ئینگلیزی ئاگادار نین کە ئەم چالاکییە بەشێکی بنچینەیی پرۆگرامی ڕەسمی زمانی ئینگلیزییە لە قوتابخانە دواناوەندییدا.

ئێمە لێرەدا هیچ نهێنییەك ئاشکرا ناکەین کە دەڵێین دەقەکانی کەرەستەی ئەم چالاکییە لە ڕێبەری مامۆستای Teacher's Guide پۆلی چوارەم و پێنجەمی دواناوەندیدا چاپکراون و هەروەها بەشێکن لە شریتە تۆمارکراوەکانی زمانی ئینگلیزی و لە زۆر قوتابخانە دواناوەندییەکان دەستدەکەون.

بۆ ڕوونکردنەوە، دوای هەر دەقێکی کەرەستەی ناوبراو دە پرسیار تۆمارکراون، بەکەم چوار پرسیار لە جۆری Yes/No و شەشەکەی تریان دووجۆرن. یەکەمیان داوای کورتە وەڵام دەکات و **short answer questions** دووەمیان داوای هەڵبژاردنی تاقە وەڵامێك دەکات لە نێوان دوو کورتە وەڵامدا **alternative questions**. ئەنجامدانی ئەم چالاکییەش، جگە لەوەی کە ڕۆڵێکی زۆر گرنگی هەیە بۆ فراوانکردنی کۆگای وشە و دەستەواژە، هۆیەکی کاریگەرە لە کەمکردنەوەی ئەو بێزارییەی کە بە ئاسایی ڕووبەڕووی قوتابییان دەبێت لە ئاکامی قورسایی ئەرکی فێربوونی زمانێکی بیانی وەك ئینگلیزی لە نێوان چوار دیواردا.

لە کۆتایی باسەکەمانەوە دەڵێین چەند توانای قوتابی بۆ تێگەیشتن واتای وشە و دەستەواژەی نوێ پتر بێت، ئاسۆ لەمە لە ڕێگەی پێشین یان خوێندنەوە بێت، ئەم وشانە بە شێوەیەکی ئاسانتر و خێراتر کۆگای ناچالاك بەجێ دەهێڵن و دەبنە بەشێکی کۆگا چالاکییەکەی وشە و دەستەواژەی قوتابی. ئەمەش تەنیا دوای چەندین بەکارهێنانی ئەم دەربڕینانەیە کە لە قسەکردن و نووسینەوەدا ئەنجام دەدرێن.

## ئەنجام

بایەخ نەدان بە وشە و دەستەواژە لە لایەن ڕێبازی پێشینەوە وتن کە ئەوە

نزیکەی سی ساڵە لە جیهاندا بڵاوبووتەوە بە تایبەتی لە قۆناغە سەرەتاییەکان فێرکردنی زمانە بیانیەکاندا بووتەهۆی کەلەبێکی زۆر گەورەی کۆگای وشەو دەستەواژەی قوتابی قۆناغی دواناوەندیو تەنانەت قۆناغی پێشکەوتوو. بەلام تەنیا شێوازی ناوبراوو رەنگدانەوەی فەلسەفەکەی لە کتێبی مەنهەجیدا بەرپرسیار نیە لەم کێشەیە، بەڵکو ژمارەیەکی زۆری مامۆستایانیش بەرپرسیارن لەم پرۆسەیە.

لەم باسە روون دەکاتەوە کە چۆن مامۆستای دڵسۆزو لێهاتوو ناوەناوە سنووری شێوازی تەقلیدی فێرکردنو کتێبی مەنهەجی جێ دەهێڵێت بۆ پەرەپێدانی توانای قوتابیان سەبارەت بە وشەو دەستەواژەی زمانی ئینگلیزی لە هەردوو لاستی تێگەیشتنو بەرهەم هێناندا.

تێگەیشتنو بەرهەم هێنانی وشەو دەستەواژەی چالاک نایەتەدی بێ تێگەیشتنی پەیوەندی سیمانتیکی لە نێوان وشەو دەستەواژەی زمانی ئینگلیزیو زمانی زگماکی قوتابی لە سەرەتادا دوای ئەمە وەدەستهێنانی شارەزایی دەربارەی وشەکان بە رێگەی سیاقی واتادارو لە کۆتاییدا بەکارهێنانیان بە مەبەستی پەیوەندیکردنی سروشتی بە راهێنانێکی رێکوپێکی قوتابیان لەسەر رۆڵگێڕاندنو پێشکەشکردنی راپۆرتی زارەکی ونووسراوی کورت دەربارەی ژیانو رووداوەکانی رۆژانە.

لە لایەکی ترەوە دەبێ وشەو دەستەواژەی ناچالاکیش لەم بایەخدانە بێبەش نەکرێت. ئەمەش لە رێگەی چالاکی خوێندنەوەی فراوانو چالاکی تێگەیشتن بە بیستن دەکرێ. لێرەدا پێویستە قوتابیان رابهێنرێن لەسەر دارشتنی وشەو هەڵێنانو بەکارهێنانی فەرهەنگی چاك.

کۆگای وشەو دەستەواژەی قوتابیان، بە چالاکو ناچالاکەوە، بە پێ سەرپەرشتیو بەشداربوونی رێکوپێکو کاریگەری مامۆستا پەرە ئەستێنێت.

## سەرچاوەکان

1. Bright, J. A. £McGregor, G. P. (1976) Teaching English as a second Language. Longman, Hong Kong.
2. Lado, R. (1979) Language Teaching, McGrow Hill, Inc., India.
3. Murcia, m£ Rosenweig, F. (1990) Teaching English as a Foregn Languages, Newbury House Publishers, Inc. USA.
4. Widdowson, H. (1979). Teaching Language as Communicatio, OUP
5. Wilkins, D. (1978) Linguistics in Language Teaching, Edward Arnold, Ltd., London.

## ملخص البحث

# «حول تعليم المفردات اللغويه في المرحلة مابعد المتوسطة»

د. عبدالحميد يعقوب جبرائيل
استاذ مساعد
قسم اللغة الانكليزية - كلية الاداب
جامعة صلاح الدين

لقد ادى اهمال المفردات اللغوية النسبي من قبل الطريقة السمعية - النطقية التي سادت مختلف انحاء العالم قرابة الثلاثين عاما الاخيرة، خصوصا في المراحل المبكرة من تعليم اللغات الاجنبية، الى فجوة كبيرة في خزين المفردات اللغوية لدى طلبة المرحلة مابعد المتوسطة وبالتالي المرحلة المتقدمة. الا ان الطريقة المذكورة وانعكاس فلسفتها على الكتاب المنهجي ليست هي المسؤول الوحيد عن هذه المعضلة حيث ان عددا كبيرا من المدرسين يتحملون قسطا لا يستهان به من المسؤولية بهذا الصدد.

يوضح هذا البحث كيف ان المدرس المخلص والكفوء يتجاوز حدود طريقة التدريس التقليدية والكتاب المقرر احيانا لتطوير كفاءة الطلبة في مجال المفردات اللغوية للغة الانكليزية ليس فقط على صعيد الاستيعاب بل وعلى صعيد الانتاج ايضا.

ان تطوير القدرة الاستيعابية والانتاجية للمفردات الناشطة لا يتحقق دون فهم العلاقة الدلالية بين اللغة الاجنبية ولغة الطالب بداية ومن ثم التعرف على استخدامها للتواصل من خلال تدريب منظم للطلاب على تمثيل الادوار وتقديم تقارير شفهية اوتحريرية قصيرة ومفهومة حول الاحداث والحياة اليومية والاهتمامات الخاصة للطلبة.

ومن جهة اخرى ينبغي عدم اسقاط المفردات غير الناشطة عن الحساب ويتم ذلك من خلال القراءة الواسعة والاستيعاب السمعي وهنا تبرز اهمية تدريب الطلبة على صياغة الكلمات والاستدلال واستخدام القاموس.

الا ان ذلك كله يتوقف على اشراف وتوجيه منتظم وفعال من جانب المدرس.

# پەندی پێشینانمان و کتێبەکەی الحکمة الکردیة ی دکتۆر بەدرخان سندی


لێکۆڵینەوە
ناهیدە رەفیق حیلمی


## پێشەکی :

یەکەم پێناسینم بە پەندەکانی پێشینانمان لە منداڵیمەوە بوو و بە هۆی خوا لێ خۆشبوو شاعیری فەیلەسووفی بەناوبانگی کورد (خاڵە)[1] (پیرەمێرد)ەوە بوو. هەرچەند دەچووین بۆ ماڵی دەمبینی ژوورەکەی سەر تاپاو دارو بەردی بە رۆژنامە بە تایبەتی رۆژنامەی (ژین) کە خۆی دەری دەکرد و بە گۆڤارو کتێب داپۆشرابوو. خۆشی هەمیشە چاوی بە سەر لاپەرەکانەوە بوو. گشت ژمارەیەکی ژین فۆزبێ چەپی لاپەرەی (یەك) وێنەیەکی بچووکی، (دەست کردەی) خۆی لەگەڵ یەکێك لە پەندەکانی دەبکردن بە شیعر، تیا بڵاو دەکردەوەو کە دەچووم بۆی دەخوێندەوە.

لەوکاتەوە کۆکردنەوەی ئەو پەندانە بوو بە خووی لێم. کاتێ کتێبی (دراسة في الشعر الکردي)ی (مامۆستا رەفیق حیلمی)م خوێندەوە کە لە فەرەنسییەوە وەرگێڕاوەتە سەر عەرەبی، لە پێشەکی یەکەیدا دیم، دانەری کتێبەکە شاعیرەی فەرەنسی (لوسی پۆل مارگریت)[2] وتویەتی: کورد زۆر ناوبانگی دەرکردووە بە پەندی پێشینان و هیچ بابەتێك نییە لەگەڵ چەند پەندێکی لە سەر نەبێت یەك یان دوانی هەبێت. مامۆستا رەفیق حیلمی وتویە کە ئەم شاعیرەیە کتێبێکیش لە سەر پەندەکانمان داناوەو خۆی واتا مامۆستا لەمەشی وەرگێڕاوەتە سەر عەرەبی‌و بە تەمایە بیخاتە ژێر چاپ. بەڵام بە داخەوە وا دیارە هەرچەند وەرگێڕانەکەی هەیە نەیتوانیوە لە چاپی بدات. جا بۆیە من لەوکاتەوە ئاواتە خوازم پاش توێژینەوەیەکی باش چیم پێبکرێت لەم بارەیەوە بیکەم و لەم دواییەدا دەستمکرد بە نووسینی بابەتێك لە سەر پەندی پێشینانمان هێشتا تەواو نەبوو بوو بیستم (نادي جمهوریە)[3] کۆبوونەوەیەکی سازاندووە بۆ هەڵسەنگاندنی کتێبەکەی دکتۆر بەدرخان سندی (الحکمة الکردیة). هەرچەند هێشتا ئەو کتێبەم دەست نەکەوتبوو، چووم (بە داخەوە بە سەرەتاکەیدا نەگەیشتم‌و گەلێکیش لەوەی وترا، بە گوێکرانەوە نەگەیشت لەبەر ناتەواوی (میکرۆفۆنەکە) هەرچۆنێك بوو. ئەم کۆبوونەوەیە بوو بە هۆی بیرکردنەوە لە گۆڕینی باسەکەم بە جۆرێك کە باسی ئەم کتێبەش بگرێتەوە، چونکە وەك بۆم دەرکەوت سەرچاوەیەکی ئێجگار بە نرخەو لە زۆر لەوانەی تائێستا بەر دەستم کەوتوون فراوانترە. بە تایبەتی چونکە پێشەکییەکەی زۆر بە سوودە بۆ ئەوانەی دەیانەوێت بچنە ژێر بنج‌و بناوانی ئەم گەنجە سامانە مەزنە کە باو باپیرمان بۆیان بەجێ هێشتووین. پێش شیکردنەوەی ئەم باسە بە گشتی، بە کورتی دەڵێم کە دکتۆر بەدرخان بەم کتێبەی (۳) ئاواتی گرنگی خوا لێ خۆشبوو (شێخ محمدی خاڵ)ی بەجێ هێناوە، کە بێگومان ئاواتی هەموومانە ئەمانەشی :-

یەك: شێخ محمد (لە پێشەکی کتێبەکەی خۆیدا) (پەندی پێشینان) وتویەتی: ئەی لاوی کورد ئەوەندەی من پەندی پێشینانم کۆکردۆتەوە دە ئەوەندەی تر[1] پەندی پێشینانمان هەیە لە دێهاتو لادێ‌و شارە کوردەکان.. کوردانەو مەردانە.. باڵی لێ هەڵماڵن‌و داوێنی لێ بکەن بە لادا بۆ کۆکردنەوەیان..

دوو ئەگەر هەموو خوێندەوارێکی کورد لە ماوەی ژیانی خۆیدا پێویستیکی کۆمەڵایەتی بەجێ بهێنایە؟ ئێستا وا رەش‌و رووت نەئەکەوتینە وڵات بەڵکو ئێمەیش وەك گەلانی تر بە سەر چڵەپۆپەی ژیانەوە هەر ساتە لە ئاوازێکمان لەخوێند.. هتد.

سێ «زۆر پەندی پێشینان وامان هەیە ئەگەر وەربگێڕێتە سەر زمانی بێگانە بە قەد سەد مەقالەی رەنگین چاو راوی باشمان بۆ ئەکات لە ناریانا»[1].

بەم جۆرە دکتۆر بەدرخان سندی هەر ئەمانەت بە دانانی ئەم کتێبەو وەرگێڕانی ئەو پەندانە بۆ زمانێکی تر بەر لە هەرچ رەخنەیەکی باش یان خراپ وشی کردنەوەی بە وردی (خزمەتێك) رازگەیەکی ئێجگار گرنگی گەلەکەی کردووە..

بۆزانینی نرخی ئەم کارە مەزنە بە سوودە دەبێت لە پێشدا بزانین، (پەندی پێشینان) واتای چییە؟ بە گشتی لای گشت گەلانی جیهان، جالای کوردیش تایبەتی، پاشان مەبەس چییە؟ لە کۆکردنەوەو پاراستن‌و وەرگێڕانیان؟ وسوودیان چییە؟؟؟

## واتای (پەندی پێشینان)(مثل - أمثال - حکم) (Proverb)

واتای بە گشتی: بە پێی فەرهەنگ: پەندی پێشینان بە کوردی واتای: (وتەی پێشوان)ە هی باو باپیرمان. بۆیە پێشیان دەڵێن (وتەی پێشینان). و دانشت بە واتای (حکمة) ؛ وتەی زانایان. وتەی مەزنان.

- بە عەرەبی = (مثل - حکم - حکمة) = (قول - حکیم).[2]

- بە ئینگلیزی = (Proverb)و (Maxim) و (adage)[4]م).

بە لێکدانەوەی ئەم وشانە = وتەی (رەوان - بێژی، قایم و توندوتۆڵ)ە. و ئەمە بەشێکە لە گشت (زمانێك) و شێوەیە کە لە (ادب)و وبژەی فۆلکلۆری کە بە زاری نەك بە نووسین بڵاو بۆتەوە. لەوانەی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیان هەیە لەم بابەتەدا کەمیان بە بەشێکی فۆلکلۆریان داناوە ئەمانەت (بۆ بکارتەو لاوقر)[5] لە کتێبەکەیاندا لە سەر فۆلکلۆر (فولکلند) کە

ساڵانی (١٩٣٠ - ١٩٥٠)ی گرتوتەوە.

شێخ محمدی خاڵ وتویەتی: پەندی پێشینان: وتارێکی کورتی ڕێکو پێکی جوانی بە تامی بە ئەوزمی بە تینی کاری گەرە کە لە دڵو دەروونێکی بێداری ئاوەدانی ئاگاداری پێشیانەوە هاتیتە دەرەوە، لە پاش بەراوردو تاقی کردنەوەیەکی زۆرو دوورو درێژە[١٠].

(ابن عبدربە) لە لایەن شێوازی وشەو ڕستەکانی ئەم پەندانە وتویەتی: المثل-وشي الكلام وجوهر اللفظ وحلي المعاني»[١١] بە واتای گفتوگۆیەکی ڕازاوەیەو کرۆکو واتایان بە نرخو بەهادارە.

ئایا پەندی پێشینان بە کەلەپور دادەنرێت یانا؟ لای خۆمان هەروا دانراوە ئەوەتا دیسان جوانی خۆشبو و شێخ محمدی خاڵ وتویەتی:-

«پەندی پێشینان میراتو کەلەپورێکی ئەدەبییە، جا بۆچ وای داناوە؟ چونکە باو باپیران لە هەزاران ساڵەوە بۆیان بەجێ هێشتووین و ئەمە زادەی بیرو باوەڕی گەلەو دەست کردەی کۆمەڵەیەو بەرزیی بیرو باوەڕی گەل نیشان ئەدا لە ناوگەلانی تردا و ئەندازەی زیرەکیو تێگەیشتن و پێگەیشتن و سەرکەوتن و بەرز بوونەوەی گەلەکە پیشان دەدا لە پلەی شارستانێتیدا ئاشکرای دەکا کە ئەو گەلە ئەندامێکی بە هێزو کارکەرەو شایستەی ژیانو مانەوەیە. ئارەچە بە وەچە بیان کەن بە ئاوێنەو لە بەر پێدا خۆیان ڕێکو پێک بکەن.

پەندی پێشینان لە دڵو دەروون کۆمەڵەدا هەڵ قوڵاوە بۆیە لە هەموو شت کاری گەورەترە لە دڵو دەروونی کۆمەڵەداو بێ جیاوازی لە ناو گشت چینێکیدا جوانەو بەکاری دێت بۆ بەهێز کردنەوەی گفتوگۆیان.

هاتو مێژووی پەندی پێشینانمان بە تەواوی بزانیایە، کێو چۆنو بۆچیو کەیو ئەو پەندانە وتراون؟ ئەو کاتە گەلێك شت لە بابەت کۆمەڵایەتی، زانین، ئابووری، سیاسەت، ڕەوشتو خوو هتد.. بۆمان ڕوون دەبووەوە.

هەر بەم واتایەش مامۆستا (اسماعيل حقي شاويس)یش وتویەتی بەم (دەستوورانە)[١٢] کورد لە (زەمان) کاتی کۆنەوە پێویستی پەسەن، ئابووری، فیکری، ڕامیاری، ڕەوشتی، تێگەیشتنی، هەڵسوکەوتی، پیشانی گەلەکەی داوە). واتە ئەمیش پەندی پێشینان بە بەشێك لە میراتو کەلەپوری (فولكلۆر)ی داناوە.

- دکتۆر بدرخان سندی ئەمەی بە ڕاستو ڕەوانی دووپات کردۆتەوە وتویەتی: «الامثال والحكم الكرديه جزء من الفلكۆر» واتە پەندی پێشینان بەشێکە لە کەلەپور. و بۆ ڕوون کردنەوە وتویە «فهي احدى اوجه التراث الفكري الإجتماعي لدى الكرد وتلعب دورا واضحا في مجال العلاقات الاجتماعيه من خلال اللغه اليومية للمدينة الكرديه او الريف الكردي» و ڕوویەکە لە گەنجو سامانی فیکرو کۆمەلایەتی لای کوردو ڕۆڵێکی ڕەوانی هەیە لە پەیوەندی کۆمەلایەتی بە هۆی (زمان) (وتو وێژی)ڕۆژانەی شارو لادێ.

بە کورتی بەشێکە لە (کەلەپور) لە (فولکلۆر)و ڕوویەکە لە میراتی بیرو کۆمەلایەتی کورد[١٣].

## مێژووی دانانی پەندی پێشینان:

کەی؟ کێ؟ لە کوێ؟ بۆچی و چۆن پەندی پێشینانی کورد دانراون؟

بە داخەوە هەتا ئێستا کەس وەڵامی ئەم پرسیارانەی بە تەواوی و بە ڕاستو ڕەوانی نەداوەتەوەو نە ئەیتوانیوەتەوە هاتوو. ئەمە بزانرایە لەو کاتە مێژووی ئەو سەردەمانەمان باشتر بۆ ڕوون دەبووەوە لە بابەت کۆمەلایەتی، زانین، ئابووری، ڕەوشتو خوو، و گشت پلەکانی تری ژیان.

ئەوی وترا وە سەبارەت بە مێژووی پەندی پێشینان زادەی لێکدانەوەی تایبەتییە، کە بە جۆرێکی لێکداوەتەوە؛ بۆ نموونە: هێندێك وتویانە: چونکە پەندەکان دەست کردەی کۆمەڵن، لەبەر ئەمە بێ گومان هێندێکیان لە ناوچەی بەرزو هێندێکیشیان لە ناوچەی پەستا دارێژراون یاخود هێندێکیان لە ناوچەی خۆیکەلواری و، زێری و پیری بەرزو هێندێکیشیان لە ناوچەی نەخۆیندەواری

وەك هەموو شیعرو داستان و گۆرانی و سەرگوزشتێکی کۆمەڵایەتی. لەبەر ئەوە هێندێکیان لە کاڵاو مەبەستێکی زۆر بەرزو جوانان و هێندێکیان بە پێچەوانەوە.. بۆ وێنەی جۆری بەکەنم: «سەد ساڵ بکەیت یەکانە پەرستی، دوایی هەر دێنێت نووشتی بە جۆری دووهەم؛ «تەحەمل ئەلێ هەمووی ئەخۆم.. دوایی ئەڵێ چیم کرد بە خۆم؟؛ بەڵام بە تێکڕایی هەموویان جوانن و هەر یەکەیان ئەستێرەیەکی گەشە لە ئاسۆی کوردەواری دا. و هەر یەکە جۆرە ڕەنگو ڕووناکی و بریسکەیەکی هەیە و نیشانەی شێکەوری نموونەی چەند کەسێك ئەکات بۆ مەبەستێکی بەرز. چونکە هەر یەکە لە بەسەرهاتو چۆنییەکدا هەڵقوڵاوە، لە خۆشی و دڵتەنگیدا، لە بوونو نەبووندا، لە بەندی یا بەحەسەڵاتیدا لە ساغی یا لە نەخۆشیدا هتد.. بۆیە ئەم پەندانە وەك ئاوێنەیەکی بالانمان چاکو چۆنیی ئەو سەردەمو دەورو بەرو ناوچانەمان پیشان دەدەن کە تیایانە پەیدا بوون و هەر یەکە مێژوویەکی تایبەتی و سەرگورشتەیەکی دوورو درێژی خۆی هەیە بەڵام بە داخەوە تا ئێستا ئەمانە نەزانراون.

ئەوەندە بە گشتی زانراوە کە زانایانو دانایانو مێژووناسو وێژەوان لە کۆنەوە مێژووی کاتی خۆیانو هی باوباپیرانیان هی دەورو بەرو کۆمەلایەتیو ئابووری، ڕامیاری و ڕوشنبیری، زانیاری و فیکری-یان بە زاری (زارەکی) بە جۆری شیعرو گۆرانیو (مەلحەمە)و داستان چیرۆکو وتەو پەندی پێشینان بڵاو کردۆتەوەو هەر بەو جۆرە لە وەچەیەکەوە بۆ ئەوی تر لە نەوەیەکەوە بۆ هی دوای و ئەمانەش هێندی تری تازەی خۆیانیان ناوە بەدەمەوە یاخود هێندێکیان لێ تێك چووەو بەو جۆرە گۆڕاوە. بەڵام دیسان هەر زۆربەیان باش پارێزراون و لە بیر ماونو هەمیشە بەکار هاتوون. لە گشتیان زیاتر پەندی پێشینان بەرگەی گرتووە بە درێژایی ئەو هەموو سەردەمانە و تاڵو ترشیو ئاسۆری ژیانی سەختی گەلەکەمان. چونکە پەندی

پێشیان سروشتێکی تایبەتی هەیە؛ کورتی رستەو رێکوپێکی خەستو خۆڵی واتاو جوانی وشەو زاراوەو هێندێکیشی وەك شیعرە یاخود بە تربەو کێشەو لە شێوەی پێی دەڵێن (سجع) بە عەرەبی، هەروەها چونکە لەمانەدا هەست بە لێشاوی راستی بیرو باوەڕەکان دەکرێتو بە جوڵانی سۆزو هەست؛ بۆیە ئەم جۆرە لەوانەی زیاتر ناوبانگیان دەرکردووەو پاراستراون و هەمیشە بەکار هاتوون، بە دەم گەورەو بچووکەوەو زاناو نەزانەوەو ژنو پیاوەوە بوون ـ بە ئاسانی لەبەرکراونو لە بیر نەچوونەتەوە. لە گشت کاتو شوێنێکدا بەکار هاتوون بە تایبەتی چونکە کورد وەك وترارە گەنجو سامانێکی ئێجگار دەوڵەمەندو بە نرخو بەهاداری هەیە لەم بابەتەداو وەك لوسی پۆل مارگریت وتویەتی کورد هیچ شتێك نییە ئەگەر چەند پەندێکی پێشیان نەبێ لە سەری، یەك دوانێکی هەر هەیە.

بەڵام بەداخەوە لەم دواییەدا پەندی پێشیان خەریکە پشت گوێ بخرێتو لە بیر بیرێتەوەو بەرە بەرە لە ئاسۆی کوردەواریدا ئاوا بێ. لە لای گەلێك کەسەوە وەك جاران بەکار نا هێنرێن زۆریان فەری دراونو ون بوونو رەنگە وتریش بین. ئێستا زۆرتر لە ناو ئافرەتی نەخوێندەواردا بەکار دێنرێن. و زۆر لە مانە کە بگرە گشت گفتوگۆیان بەم پەندانەیە، و پەندەکان زۆریان هێشتا نە نووسراونەتەوە، کە (خوا لێی بوردن) پەندەکانیشیان لەگەڵ دەنێژرێن و ئەگەر هەر وا بڕوا بێ گومان پاش ماوەیەك زۆریان ئەگەرێنەوە باوەشی پێشیانو زیندە بە چاڵ دەبن. لە بەر ئەمەو چونکە وەکو ئێمان وەدوو پاتی دەکەینەوە؛ پەندی پێشیان گەنجو سامانێکی بە نرخی گشت گەلو میللەتێکەو بەشێکی زۆر بە سوودی کەلەپوورەو ئاوێنەی مێژووی ژیان ئەتەوەکەیە بۆ خۆشیو بۆ ناسینی بەگەلانیتر، پەندی پێشیان لە رۆژهەڵاتیشو لە رۆژئاوایش خرابوونە کارو زۆریان کراون بە شیعرو توێژینەوەو لێکۆڵینەوەیان لەسەر دەکرد کتێب و بابەتی زۆریان دادەنا بۆ پاراستنیان. لە سەردەمی (١٦) هەم و (١٧) هەمدا ئینگلتەرە لەمەدا گەیشتبووە لوتکە . . ، وەك (جۆن های وود)[١٢] و لە ئەمەریکا بنیامین فرانکلین ١٧٣٢ـ١٧٥٧ لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا دەست کرا بە توێژینەوە لە بارەی فولکلۆر، بە تایبەتی پەندی پێشیان کە کەرەستەیەکی زیندووەو شارستانی فولکلۆری دێرینەیی گەلان پیشان دەداو کە وەك لە پیشان وتمان زادەی بیرو باوەڕی گەلە و دەستکردەی کۆمەڵو بەرزیی بیرو باوەڕی گەل پیشان دەدا لە ناو گەلانی تردا و ئەندازەی زیرەکیو تێگەیشتنو رادەی پێشکەوتنی لە شارستانێتیدا.

لای خۆمان یەکەم کەس کە بیری لە کۆکردنەوەی پەندی پێشیان کورد کردبێتەوە و نووسینیان مەلا محمود بایزیدی بووە بۆ درێژەی مێژووی نووسینەوەیان بڕوانە. باسی سەرچاوەکان.

شێوەی دارشتنی پەندەکان: هێندێکیان وەك شیعر رێکو رەوانو بەرانبەرن، و هێندێکیان لە شێوەی (سجع). یاخود (پرسیار و وەڵام)ن

١ـ وێنەی پەندە شیعرییەکان: «ناوی برواو بۆر و خانە، خۆیشی بیخوانەك بێگانە»

٢ـ لە شێوەی پرسیار و وەڵام:

«کوێرە چیت ئەوێ؟ دوو چاوی ساغ»

٣ـ هێندێکیان تەنها رستەیەکی کورتن هێندێکیان دوو رستەن. . بەدەگمەن هەن لە دێرێك زیاتر بگرنەوە.

وێنەی یەك رستەیی کورت: «سواڵ کیمیایە»

هی دوو رستەیی: «ساڵ بە ساڵ، خۆزگە بە پار».

زۆر لە پەندەکان کراون بە شیعر یا لە ناو شیعردا بەکار هاتوون. وەك ئەوانەی پیرەمێرد لە رۆژنامەی (ژین)دا بڵاوی کردونەوە. ئەم چونییەی دارشتنی پەندەکان، بەو شێوانەی سەرەوە. (کورتی دەستەواژەو رستەکان و خەستی واتاو هێزی واتەکان لە سەر جوڵاندنی دەستو سۆز. بوونە هۆی ئاسان لەبەر کردنیان و وتنەوەیانو لە بیر هاتنەوەیانو بەم جۆرە پاراستنیان لە ون بوون و فەوتاندن، بە درێژایی ئەو سەدانەی کە هێشتا تێیدا. بە نووسین نە نووسرا بوونەوە و لەبەر ئەوەیش کە لە ناو کوردەواریدا و لە رۆژئاوایشی شاعیرو ئەدیبان هەوڵیان داوە کە ئەوانەی بە شیعر نەبوونو دەشێت، بیانکەن بە شیعر یان ناو شیعردا بڵاویان بکەنەوە، وەك هێنەکانی پیرەمێرد بوونە هۆی پاراستنیان بۆ وێنەی شیعرەکانی پەندی پێشیانی پیرەمێرد بڕوانە گشت ژمارەکانی رۆژنامەی ژین و کتێبەکەی باسی پیرەمێرد:



(وا لێرەیشدا نموونەی یەکێك لەمانە پیشان دەدەین).

نموونەی یەکێك لە پەندەکانی پێشیانی کورد بە شیعری شاعیری کوردی بە ناوبانگ پیرەمێرد:

گەردو خۆڵی ئەم ئاسمانە شینە . .
هەرچی‌ی لێ روودا دروێ مەبینە

چلکە هەو   دی بە داوو بەتاو
لە پاشی نیو سەعات ئەیکابە لافاو

خانوی هەزاری پێ ئەروخێنێ
تووی زۆر داری پێ دەرمووێنێ[1]

ئەم رەنگاو رەنگەش ئەبینی ئینسان
«ئەڵێی نە بایان دیوەو نە باران»

### کتێبەکەی «الحکمة الکردیة» :

### (پەندی پێشینان)ی کوردی ، دکتور بدرخان سندی :-

ئەم کتێبە ساڵی ١٩٩٠ز (دەزگای روشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی)· لە چاپخانەی الحریة لە بەغدا لە چاپی داوەو بلاو کراوەتەوە . کتێبەکە بریتییە لە (٣٤٠) لاپەرە . وزۆر بە جوانی و روونی و پوختەیی لە چاپ دراوەو بەرگێکی قەشەنگی ناپای تونلو تۆڵی بۆ کراوە ؛ بەرگی پشتەوەی ، لە سەر شێوازی چاپەمەنی کتێبی رۆژ ئاوایی وێنەیەکی بچووکی دانەر لەگەڵ لیستەی گشت بەرهەمەکانی بە رێکوپێکی تیا بلاوکراوەتەوە . بەرگی یەکەم سەرەتای کتێبەکەو دەزگای بلاوکردنەوەو ناوی دانەری و وێنەیەکی قەشەنگی دەستکردەی هونەرمەندانەی لەسەرە .

### جۆرو شێوازی دانانی کتێبەکەی الحکمة الکردیة :

کتێبەکە کراوە بە سێ بەشەوە ؛ یەك : سەرەتا . نووسینی دانەری کتێبەکە ، دکتور بدرخان سندی . دوو ناوەرۆك : کۆمەڵەیەك (پەندی پێشینانی کورد)ی دکتور بدرخان کۆی کردونەوەو کردونی بە عەرەبی و لێکی داونەوەو واتایان ، مەبەستیانوکانی بەکار هێنانیان نووسیوە . هەورەها بیر ورای لە سەر هێندێکیانو وێنەی ئەوانەی وێنەیان هەیە لە عەرەبیدا پیشان داوە .

پەندەکان بە پێی بابەت رێکخراون بەم جۆرە - خودا - نیشتمان - بیر (عقل) و ئامۆژگاری - ژیانو مردن مالو راستی - کار و پشت بە خۆ بەستن - پارەو سامان - چاکو خراپ - ئازایی و ترس - پەیوەندی کۆمەڵایەتی و خێزان - زمان (اللسان) - پەروەردەو شارەزایی - دڵداری خۆشەویستی و خۆش هیوا - ئارام چارە نووس پەزانین - هاوبەشی و یارمەتی دان - قەرز - (دەست بلاوی) بەخشندەیی - چلێسی - میوانداری - درۆ ، دزی فرو فێڵ ناوبانگو رووگیری - جۆراو جۆر (همه چه‌شن) .

### سێ - سەرچاوەکانی کتێبەکە :-

دانەری کتێبەکە لە پێشەکی‌یەکەیدا زۆر بەرێکی و پوختەیی و بەشێوازی زانستیانە ، مێژووی کۆکردنەوەو نووسینەوەو وەرگێرانی پەندی پێشینانی گێراوەتەوە بۆمان ؛ (باسی کورد و بێگانە گشت ئەوانەی لەم بوارەیان داوەو چۆنو کەی و لە کوێ و بە چی زمانێکو ناوو سەرەتای بەرهەمەکانیان ؛ کتێب ، یاخود بابەتو لەمانە لە کام گۆڤار یاخود رۆژنامەدا بلاو کراونەتەوەو لە چی دەدوێن؟) .

. بەلام کاتی لیستەی سەرچاوەکانی خۆی بەکاری هێناون دیارە هەر ئەوانەی ژماردوون کە بەر دەستی کەوتوونو سوودی لێ وەرگرتوون لە کتێبەکەیدا . ولەمەیش لیستەی لەو سەرچاوانەیە کە بەکاری هێناون :-

### لیستەی سەرچاوەکانی کتێبی (الحکمة الکردیة)ی دکتور بدرخان سندی :

١ . پەندی پێشیان (شێخ محمدی خاڵ) ساڵی ١٩٥٧ ١٩٢ لاپەرەیە بە پەراوێزەوە .

٢ . هەزار بێژ وو پەند (معروف جیلوك) ١٩٣٨ .

٣ . مەسەل ئۆمەتەلۆکێ (اوردخان جلیل و جلیل جلیل) .

٤ . گوتنێت مەزنا وتەی مەزنان (حاجی جعفر) .

٥ . پەندی کوردی عمر شێخ الله .

٦ . کۆمەڵە تێکستی فولکلۆری کوردی (کوردیف) .

ب - ئەوانەی بێگانە دایان ناون :

١ . (بروانە پەندی پێشینان)ی (دکتۆر رمضان عبد التواب) (رودلف زولهایم)

٢ . العقد الفرید ابن عبد ربه

٣ . البرهان فی وجوه البیان (ابو الحسن بن وهب) .

٤ . ئینسایکلۆپدیا بریتانیکا .

٥ . کتێبی رۆژیە لیسکۆ بە کوردی و ئەرمنی . (رەنگە رۆژیە)ش کورد بێت لە (رۆژ) هاتبێت ئەگەر (رووژ) نەبێت بە واتای (سوور) .

■ لیستەی سەرچاوەی (پەندی پێشینان کورد) بە پێ سەرەتای کتێبی (الحکمة الکردیة)ی دکتۆر بدرخان سندی
بە پێی ساڵی دانانو بلاوکردنەوە :

بەگشتی دکتور بدرخان لە (پێشەکی) کتێبی الحکمة الکردیة وتویەتی : یەکەم کەسی بیری لە پەندی پێشینان کورد کردبێتەوە رۆژهەلاتناسەکان بوون و زیاترین ئەوانەی (بەکێتی سۆڤیاتی کۆن) و بە تایبەتی ئەرمەنییەکان .

١ . (ابو لیان) زانیاری ئەرمەنی لە ناوەندی سەدەی نۆزدەهەمدا نیشانەی دەوڵەمەندی فولکلۆری کوردی ولەمەهی پەندی پێشینانی کردووە . هەر وەها باسی پلەی بەرزییان .

لە زانیارانی بە ناوبانگی فولکلۆر ئەوانەی ئرخیان داوە بە فولکلۆری کوردی .

٢ . ف . ا . کوردلفسکی[10] .

٣ . ن . یامار .

٤ . اوربلی[11] .

٥ . ف مینۆرسکی .

چالاکی ئەمانە بنەمای تۆمار کردن لەفۆنۆغرافیاو زمانەوانی کوردی دامەزراند. ئەمانە هەوڵیان دا فولکلۆری کوردی کۆبکەنەوەو ڕێکیان بخەن.

چەند کتێبێکی بە نرخی بەهادار لە بواری (فولکلۆر) کە لە بۆری کوردیدا دانرا لە لایەن ڕۆژهەڵاتناسەکان وەك.

٦/أ. سۆتسین

٧/ئە. بریم

٨/أ. زاباومان

٩/ماکش ..

١٠/ هایکۆن

١١. بیوتر لیرخ ڕۆژهەڵات ناس ساڵی ١٨٥٧ کۆمەڵەیەك پەندی پێشینان کورد لەوانەی (بایەزیدی) کۆی کردونەتەوەو وەری گێڕاونەتە سەر ئەڵمانی و ڕوسی. واتە یەکەم کۆکەرەوەی پەندەکان (مەلا عەمودی بایزیدی) بووە.

١٢. لیفی ازلروفنا ئیرسراوی بریهان لە ئەرمینیا لە چالاکی کۆمەڵەی (جوغرافیای ئیمبراتۆریەتی ڕوسیای) (جلران) لە ناوچەی قەفقاسیادا کتێبێکی داناوە بە ناونیشانی (وێنەی پوختەی ئەتنوگرافیا) سەبارەت بە کوردی و لایەنی ایریفان) و ساڵی ١٨٩١ لە (تبلیسی) لە چاپ دراوە.

١٣. سارکیس هایکۆنی شارەزای تایەتی فولکلۆر (ئەرمەنیە) گەلێك (پەندی پێشینان کورد)ی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ئەرمەنی و لەگەڵ کوردیەکانی لە (ترانسکریبسیا)ی ئەرمەنیدا تۆمار کردووە ئەمە بۆتە سەرچاوەیەکی بەهاداری بە نرخ بۆ ئەوانەی ئارەزوو دەکەن توێژینەوە بکەن لەسەر پەندی پێشینانی کورد.

١٤. مێجەر نوئێل ـ (حاکمی سیاسی ئینگلیز) توێژینەوەیەکی بە ناونیشانی (کەسێتی کورد) وەك لە پەندەکانیاندا دیاری دەدا) لە گۆڤاری (دراسات)ی ڕۆژهەڵاتی و ئەفەریقی) لە لەندەن بڵاوکردۆتەوە. سوودی لە ژیانی لە حەکاری لە کوردستان وەرگرتووە.[١٣]

١٥. ساڵی ١٩٥٧ لە یریفان (پایتەختی ئەرمینیا) کتێبێك دەرچووە بە ناوی (فولکلۆری کرمانج) (٣٦٠) پەندی تێدایە بە زاری لە دەم ئەوانەی وەلویانە وەرگیراون ـ بە پێی پیت دابەش کراون.

١٦. ساڵی ١٩٦١ لە مۆسکۆ (چاپخانەی آدابی ڕۆژهەڵات) کتێبێکی دەرکردووە نە ناونیشانی (پەندی گەلە ڕۆژهەڵاتیەکان) (٣٥٠) پەندی کوردی تێدایە (قناتی کوردۆ) مامۆستای توێژینەوەی کوردی لە (ئاموزگا)ی (ڕۆژهەڵات) لە لینینگراد وەرگێڕانی کردوون بە ڕوسی.

١٧. نووسەر و شاعیرەی فەرەنسی (لوسی پۆل مارگریت) بە یارمەتی (ئەمیر کامەران عالی بەدرخان) کتێبێکی لە سەر پەندی پێشینان کورد داناوە بە فەرەنسی و ئەمە مامۆستای خوالێ خۆشبوو ڕەفیق حیلمیش لە وەرگێڕانی کتێبەکەی هەمان شاعیرە کە بە ناوی (دراسات في الشعر الكردي) بە باسی لەمەی کردووە (وەك وتومانە خۆشی لە فەرەنسیەوە کردوونی بە کوردی).

١٨. (ڕۆژیە لیسکۆ) ساڵی ١٩٣٧ کە وەك ڕۆژهەڵاتناسەکانی تری فەرەنسا بە هۆی بەدرخانەکانەوە پەندی پێشینانی کوردیان ناسیوە بابەتێکی لە (گۆڤاری لیسلامی)دا لە بارەی پەندی پێشینانی کوردەوە بڵاوکردۆتەوە، ئەمانە هێندێکیان لە نووسینەکانی ئەمیر بدرخانەوە و هێندێکیشیان بە زاری وەرگرتووە. بریتین لە (٢٨٠) پەند بە پێی بابەت دابەشی کردوون وەك ئابڕوو (شرف) خۆشەویستی. دڵداری مێژوو ـ ئلوات ـ هەست و سۆز. خۆپەرستی (بەگشتی سەروشتی ژیان، کۆمەڵایەتی کوردی شاخ ودەشت وەدەر پیشان دەدات).

لەمالە کوردی خۆمان یەکەم کۆکەرەوەی پەندەکانی پێشینان کورد مامۆستا (اسماعيل حقي شاوەیس بووە) کتێبی (قسەی پێشینان) گوستاو لۆبۆن ساڵی ١٩٣٣ لە بەغدا لە چاپ داوەو بڵاوکردۆتەوەو پیرەمێرد شاعیر و ئەبەلەسووفی بە ناوبانگی کورد (٦٥٠٠) هەزار پەندی لەمانە، کردووە بە شیعر هەر جارە یەکێك لەو شیعرانەی لە ڕۆژنامەکەی خۆیدا (ڕۆژنامەی ژین) بڵاو دەکردەوە.

ـ دوامین کتێب لەم بوارەدا وەك دکتۆر بدرخان سندی وتویەتی هی مامۆستا حاجی جەعفەر (قسەین مەزنا) وتەی مەزنەکان ساڵی ١٩٨٦ز لە چاپ دراوە بریتیە لە (٤٥٠) پەند. بە پێی پیتەکان ڕێکخراون پێش ئەمە ١٩٨٠ مامۆستا عمر شێخ بە زاری بە چەپی کۆمەڵەیەکی لە چاپ داوە بەوەی کتێبی (الحكمة الكردية)ی دکتۆر بدرخان سندی ساڵی (١٩٩٠)ز لە چاپدراوە لە چاپخانەی الحرية لە بەغدا ئەم کتێبەی دکتۆر سندی دەبێتە دوامین کتێب لە عیراقدا کە لە بارەی پەندی پێشینان کورد نووسراو یێتەوەو بڵاو کرایێتەوە...

ـ جگە لەم سەرچاوانە ـ گەلێك گۆڤارو ڕۆژنامەی کوردی[١٨] بە تایبەتی کۆنەکان وەك (دیاری کوردستان ـ هەدیەی کوردستان دەنگی گێتی تازە ـ هاوار ـ ڕوناهی) و گەلاوێژ هتد.. ئەمانە یان لاپەرەی تایبەتیان بۆ ئەم پەندانە تەرخان کردووە یاخود ستوونێك لە گشت ژمارەیەکدا.

## سەلماندنی[١٩] کتێبی (الحكمة الكرديه)ی دکتۆر بدرخان سندی

وەك لە سەرەتادا وتمان (یانەی جمهوریە) بە مێژووی ٢٥/ك١/١٩٩٤ ئێوارێکی ڕێکخستبوو بۆ سەلماندنی (لێکۆڵینەوەو شی کردنەوەی) لە کۆشکی ڕۆشنبیری لە بەغدا ـ بە بەڕێوەبەردنی د. حسن جاف و لە ئەندامەکانی بەشدارییان کردبوو ـ... محمد عروس و ـ سالم الالوسی و ـ

بە داخەوە بە سەرەتاکەیدا نەگەیشتم و لەبەر لاوازی دەنگە گەورەکەرەکە زۆری وتووێژو ڕەخنەکان بە گوێ گران نەگەیشت. وچونکە بەزۆر لە سەرەتاکەی دکتۆر حسن (بە سوپاسی زۆرەوە) وتارەکانی ترم دەست نەکەوت، لەبەر ئەوە ناتوانم بە تەواوی ئەم لایەنەوە بدوێم، بەڵام بە پێی ئەو

ڕەخنەنانەی بە (گونیم)دا هات دەتوانم بەکورتی بڵێم ئەوانە گشتیان ڕەخنەی زمانەوان بوون تەنها لە بابەتی کتێبەکە بە گشتی یاخود بە تایبەتی ، پەیوەستن لەم لایەنەوە، مەبەستی ئەم جۆرە کتێبانە . بە گشتی و مەبەستی نووسەر لە دانانی کتێبەکەی، و سوودی دانانی کتێب، لە سەر ئەم بابەتە بە گشتی و سوودی ئەم کتێبە بە تایبەتی ، ئایا هیچ نرخێکی هەیە بۆ گەلەکەی؟ ئایا هیچ کەلێنێك دەگرێتەوە لە کتێبخانەی بەرهەمی چاپەمەندی کوردی بە گشتی و لە می کەلەپوور بە تایبەتی پەندی پێشینان کوردیدا؟ ئایا ئەم کتێبە بەهای زانستی دانانی کتێبی بە کارهێناوە ئایا دانەری مافی خۆی داوەتێ بە لێکۆڵینەوە توێژینەوەو شی کردنەوەو پشکنین و بەکارهێنانی سەرچاوەی پەسەند؟ هتد . . ئایا ئەگەر پاش وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەو پاش بە سەردا چوونی ئەم کتێبە لەم بەرگە بۆ ئەو بەرگی و خوێندنەوەی چی (سەرەتا، پێشەکی، پێش دەست، لێ بێ، ڕوون کردنەوە، لیستەی ناوەرۆك، لیستەی سەرچاوەکان تەنانەت سوپاسی یارمەتیدارانیشی جا خوێندنەوەی ناوەڕۆکی زۆر بە وردی و هێمنی و دڵسۆزی و تۆمار کردنی تێبینی خۆی بە وێنەی نووسینەکە و ژمارەی لاپەڕەوە بۆ بەراوێز و بەراوردکردنی نووسینەکە لەگەڵ سەرچاوەکانی کتێبەکە و هەر سەرچاوەیەکی تر بەدەست ڕەخنەگرەوە بێت پلەی بەرزیی ئەم کتێبە و ڕادەی ڕاستی و ڕەوانی و سوودی بۆ توێژینەوەو لێکۆڵینەوەو وەك سەرچاوەی زانستیانەی، بۆ دابنێین؟ چەندی بۆ دەژمێرین؟؟؟ بێ لایەنگیری نە بە چاك نە بە خراپ بەڵام بە ویژدانێکی پاك و خاوێن و سەر ڕاست و ماف ناس بووە؟؟؟

تا بەم جۆرە بەشی هەرچ کتێبێك هەرچ بابەتێك و هەر نووسەر و دانەرێك و شاعیر و شیعرێك بخرێتە ژێر دووربینی ڕەخنەوە ا ئەو کاتە ئەو دووربینە دەتوانێت بنچینەی بناوان شی بکاتەوەو لە یێزنگی بداتە و چاك و خراپی جیا بکاتەوە بە تەواوی بێ کەم و کوڕی و مافی خۆی بدات .

**کورتەی ڕەخنەکان لە دیدارەکەی یانەی جمهوریە : -**

ئەو ڕەخنانەی لە دیدارەکەدا بەرگوێمان کەوتن بە کورتی ، وەك وتمان ، سەبارەت بە زمان بوون ، لێرەدا (زمانی عەرەبی) کە دکتۆر بەدرخان وەرگێڕانەکەی پێ کردووە . دکتۆر خۆی وەڵامی ئەمانەی دایەوە . ئەمانەش هێندێك لەو ڕەخنانەو وەڵامەکانی دکتۆر و بیروڕامانە .

وا باشتر بووکە وەرگێڕانەکە بە شێوازی (سجع) بووایە دکتۆر بەدرخان : (ئەمە ڕەنگە ببوایەتە هۆی گۆڕینی واتاو مەبەستی پەندەکان) . پەندەکان خۆیان بە کوردی زۆریان بەم جۆرە بوون بەڵام هەرچەند نووسەر دانا و زمانزان بێن دیسان هەر لە وەرگێڕاندا تریبەو کێشێك دەچن . وبۆ زێك خستنی بەم . جۆرە ڕەنگە وشەیەك بە کار بهێنرێت کە واتاو مەبەستی پەندەکە بگۆڕێت .

٢- بۆ دانانی گشت پەندەکان بە کوردییەکەشیان =

دکتۆر : (ئەمە زۆر گرانە ، چونکە پێ ئەوە کتێبەکە گەورەیە جا بەوەشەوە زۆر گەورەتر دەبوو و لە ئەرکی تێچوونی خۆی جیا دەبوو .

٢- گۆڕینی هێندێك وشەو ڕستە بە وشەی تر یاخود ئاڵوگۆڕ کردنی جێگەی وشەو ڕستە . .

د . ئەمەیش دیسان ڕەنگە ببوایەتە هۆی تێکچوونی واتاو مەبەستی پەندەکە . یاخود بە پێی دەستووری زمان نەشێت وەرگێر بە تایبەتی بۆ ئەم جۆرە بابەتانە دەبێت هەر ئەو وشانە بەکار بهێنێت کە واتایان دەپارێزێت تەنها وشەی جوان و قەشەنگو لەبەرانەی توانای زمانزانی پیشان دەدەن بەڵام دوور نییە هەمان واتا نەدات یان ببێتە هۆی تێکدانی مەبەس گۆڕینی جێگەی وشەو ڕستە . ڕەنگە ئەوەی لە زمانێکدا دەشێت لەم لایەنەوە لە گەڵ زمانێکی ترو دەستووری نەگونجێت وەك ڕێکخستنی کردەو کارکەر و پاشکۆ لێنخستیان . بۆ وێنە بە کوردی دەڵێین (سێوەکەم خوارد) بە عەرەبی دەڵێن (اكلت التفاحة) . هتد . .

بە گشتی و دیسان بە کورتی لێرەدا بیرو باوەڕی خۆم پیشان دەدەم بە ئومێدی ئەوەی گشت بیورن لە هەرچ کەم و کوڕیەکی لە مانەو کەسی دڵگیر نەبێت چونکە مەبەستمان چاکی بەو بەس و ڕەخنە لێ گرتنی کەسی نییە .

بە کۆمەڵی ئەو ڕەخنانەی لە دیارەکەدا نیشان کران پاش پیاچوونەوەی ناوەڕۆکی کتێبی (الحكمة الكردية) دەتوانین بڵێین کە دکتۆر بەدرخان خۆی پاش و بەراستی ڕەوانی وەڵامی تەواوی دانەوە بەڵام هاتوو دکتۆر خۆی دەستی بکاتەوە ماوەی بێت تا پاش بەسەر کتێبەکەیدا بچێتەوە لە سەرەوە لە چاپی بداتەوە دەتوانێت هەر ئەو پەندانەی ماوە هەیە دارشتەکەیان یان هێندێك وشەیان بگۆڕێت تا وەکو شیعر یاخود (سجع) دەربچن چونکە ڕاستە ئەم جۆرە دارشتانە جوانتریان دەنوێنێت و بە ئاسانتر لە بیر دەبێتەوە لەشەنگی و کێش بایەخی زیاتریان پێ دەداتەوە نرخی کتێبەکە بەرزتر دەکاتەوە بەڵام ئایا دکتۆر بەدرخان سنلی ئەو ماوەیەی هەیە؟ بۆ وەڵامی ئەمە ناسی لیش و کار و ئەرکی دکتۆرمان کردبوو دکتۆر ئەمەی بە زیاد زانیوەیی لابردین تەنها بە (مەدحی) دانراوێت . بە ڕاستی مەبەستی سەرەکیمان لە باسی ئەم کتێبە ئەوە بوو کە بڵێین :

کاتی خستنە بەرهەمی نووسەرێك ، دانەرێك ، هونەرمەندێك ژێر دووربینی ڕەخنەوە نابێت بکەوینە گیانی ئەو بەرهەمە خاوەنەکەی و چی کەم و کوڕییەك بوو هەر ئەوە بخەینە ڕوو وهێندی تریش گەورەی بکەین و پشت بکەینە هەرچی سوودو بەرزو بوومی باشی هەیە . دەبێت زۆر باشی بە سەریدا بچینەوە چەند جار و زۆر بە وردی بپشکنین لە تای تەرازوودا و بۆ ئەمە پێویستە سەرچاوەی تریش لەو بابەتەدا بخوێنینەوە یاخود دەستێکی بالآمان هەبێت لە زانیاریدا ئەگەر هەر تایبەتمەندیش نەبێت لەو بوارەدا ، هەروەها بە لای منەوە زۆر پێویستە کە ڕەخنەگر زانیارییەکی باشی هەبێت سەبارەت بە خاوەن نووسین و کتێبەکە ، بزانێت چی بە ڕاستی لە باردا هەبوو ئایا ئەو بەرهەمەی بە سەنگی توانا و زانینی؟ ئایا ئەگەر کەم و کوڕی هەبێت لە نەزانینی یان لەبەر بار و دۆخی تایبەتی خۆی و گشتی یە یاخود لەبەر گوێ

ئەدانو هۆی ئره. ئایا کتێبەکە بە گشتی و بە چی کەمو کورتیکیش هەیێت، هیچ سوودێکی تایبەتی یاخود گشتی هەیە . . . ؟ یاخود نووسەر توانیویەتی بگات بەو مەبەستەی کە بۆی داناوە؟ و ئەو مەبەستە هیچ نرخی هەیە بۆ گەلەکەی یاخود بۆ خوێنەروار. لەبەر ئەمە هێندێك لە کەسێتی و رەوشتو زانیاری و خوێندنەوەی بەرهەمەکانی تری دکتۆر بدرخان سندی دوا بووم بەلام بە داخەوە ریگەی ئەوەی لێگرتم بەوە بابەتەکەی لێ گەریم چونکە خۆی سەر نووسەری گۆڤارەکەیەو نابەوێت باسی تایبەتی بلاو بکرێتەوە..

## پەندەکانی پێشینان لە کتێبی (الحكمة الكردية) :

ئەو پەندانەی لێرەدا تۆمار کراون بێ گومان گەلێکیان لە کتێبی تریشدا دەبینرێن بەلام زۆریشیان لە سەرچاوەی را هاتوون کە رەنگە بەردەست کەم کەس کەوتبن، لەبەر ئەوە ئەمە بە گەنجینەیەکی فراوانتر دادەنرێت لەم بابەتەداو بەمە زۆرترین پەند دەپارێزرێت لە ون بوون یان فەوتاندن. جگە لەمە جۆری ریکخستنیان بە پێی بابەتو دابەش کردنی بابەتەکان بەم شێوە نوێیە دەیێتە هۆی پێنیان لە چوارچێوەیەکی تازەتر داو بایەخ پێ دانیان بە جۆرێکی هەمە رەنگە. وکاتی ورد بوونەوە لە لیستەی دابەشکردنی پەندەکانو ریکخستنیانو لەشی کردنەوەی هەر پەندەو بیر ورای سەبارەت بە هێندیکیان هەست دەکەین کە دکتۆر بدرخان سندی وێنەیەکی رەوشتو هەستو بیر و رای خۆیمان پیشان دەدا. سەرنج بدەنە پاش و پێشخستنی بابەتەکان، دەبینن یەکەم بابەت دایناوە (خودا)یە و یەکسەر پاش ئەو (نیشتمان) جا (عقل) بیر و ئامۆژگاری ـ ژیانو مردن ـ راستی و ماف . .

ئەوی شایانی باسە کە لە پاش خودا (نیشتمان)ی داناوەو ئەمە کەم نیە.

بروانە جۆری دابەش کردنی ئەوانەی لە کتێبی تردا نووسراون وەك لە کتێبەکەی مامۆستا اسماعيل حقي شاويس بە (سیاسی) دەستی پێ کردووە جا ادبي اقتصادي. ولە هی شێخ محمدی خال بە پێی پیت رۆیشتووە . .

بروانە بیر و رای دکتۆر بدرخان سەیرمت بە زۆربەی پەندەکان دیسان هەست دەکەیت کە ئەوانەی نیشانەی نیشان کردووە کە هەستی بەرزو رەوشتی چاکیشانی دەدەن.

## ئایا کتێبی (الحكمة الكردية)ی دکتۆر بەدرخان سندی هیچ سوودو نرخێکی هەیە بۆ گەلەکەی یاخود بە گشتی؟

بێ گومان نرخێکی زۆر گرنگی هەیە :ـ بەگشتی : ئەمە سەرچاوەیەکی نایابە بۆ خوێندنەوە نوێژینەوە لە بابەتی کەلەپورەو پەندی پێشینان بەشێکە لە کەلەپور. ۲/ سوودێکی بێ هاوتای هەیە بۆ کورد بە تایبەتی بۆ ناسینی بیگانەو نەوەکانی تر بە نەوەی کورد، بۆ زانینی نرخی کەلەپورمانو فراوانی بۆ بینینی رادەی تێگەیشتنو پێگەیشتنی و روشنبیری و زانیاری و دوور بینی و لێکدانەوەی کورد. و بۆ کورد خۆی ئەمە سەرچاوەیەکی تری ئەو پەندانەیە کە لە باوباپیرمانەوە بۆمان ماوەتەوەو هێشتا زۆریان تۆمار نەکراونو مەترسی هەیە لە ون بوونیان. وبێ لایەنگیری دەڵێم کە تائێستا چەند کتێب لەم بابەتەدا دانراون بە کوردی هەرچەند گشتیان بە نرخو بە سوودن بەلام دەتوانم بڵێم ئەم کتێبە جیاوازی هەیە لە گەڵ ئەوانەو ئەو جیاوازیە زۆر زۆر بایەخدارە بۆمان ـ پێشەکی ئەم کتێبە وەك باسمان کردووە لە سەرەتاوە باشترین سەرچاوەیە بۆ سەرچاوەی پەندی پێشینان کورد ئەوەو سەرچاوەکانی کتێبەکە خۆی دەرگایەکی فراوان دەکەنەوە بۆ گشت ئەوانەی لە مەودوا بیانەوێت لەم بوارە بدەنو بە ئاسانی دەست بخەنە سەر ئەو گەنجو سامانە بە هادارەی بۆمان ماوەتەوە. هەروەها دکتۆر بەو پێشەکیە چاومان روون دەکاتەوەو دڵمان خۆش دەکات بە زانینی نرخی کەلەپورمان لای بیگانەوە دانانی کتێبو نووسینی بابەت لە سەر پەندەکانمان بە زمانی خۆیان و ئەمەش هانمان زیاتر دەدات کە خۆشمان تا بتوانین زیاتر لێی بکۆڵینەوە وەریان گێرین بەو زمانانەی دەیانزانینو بیانپارێزین.

## چەند تێبینیەك لە پەناو پێچدا :

وەك زانراوە هیچ شتی و هیچ کەسێك نیە بێ کەمو کورتی بێتو وێنەی بێت. لەبەر ئەوە بۆ یەکێکە ناسراوە بە زۆری و گرنگی ئیش و کاری لێرسراوی بێ گومان هەر تۆزێك ناتەواوی لە پەناو پێچدا بەرچاو دەکەوێت. (ئەگەر زۆر بە وردی پشکنرێت بۆ رەخنە لێ گرتن) وەکی تر ئەملە هیچ ئەوە ناهێنن هەر باسیش بکرێن چونکە زۆر ساکارو بێ نرخن یان نرخێکی وەهایان نیە شایانی باس بێو هیچ لە رادەی بەرزیی ئەم ئەرکە بە نرخەوە کەم ناکاتەوە. بەلام دیسان و رەنگە هەر بۆ ئەمەی ئێمەش بڵێین کتێبەکەمان لا بەریزە، بۆیە هەر بە سەرزاری چاومان پیا ئەخشاندوە بگرە زۆر بە وردی پیاچوینەتەوەو چەند وێنەیەکمان هەڵبژاردووە بۆ وێنە بە ئومێدی ئەوەی هاتوو دکتۆر کتێبەکەی دووبارە لە چاپ دایەوە رەنگە بتوانێت سوودیان لێ وەرگرێت ئەم چەند تێبینیە نیشانە دەکەین :

پێش لەمە دووبال دەکەینەوە کە وەرگێران ئاسان نیەو چاکترین وەرگێر بە گرانی دەزانێت چی وەرگێرێت بە وێنەی دەقەکە بێتو بە هامان ترپەو کێش و واتا، چونکە وەرگێر وەك دانەر سەربەست نیە، کام وشەو رستەی لا قەشەنگو جوان بوو بە دڵ بوو و چۆن ویست داینێت و رێکی بخات. وەرگێر دەستی بەستراوە دەبێت چی وترلوەو بە کام شێوەو جۆر و مەبەستی هەر ئەوە دابنێت بۆیە وەرگێرانەکە هەمان ترپەو کێش و تامی بۆی دەقەکەی نایێت دکتۆر بدرخان خۆشی ئەمەی نیشان کردووە بەلام دیسان هاتوو وەرگێر ماوەی هەبوو چەند جارێك بەسەر وەرگێرانەکەیدا بچێتەوە، بە تەنها جولاندنی هێندێك وشەو رستەو بە دۆزینەوەی وشەی قەشەنگترو بە ترپەو کێشتر بۆ هەمان وشە بە مەرجێك بە هەمان واتاو مەبەس بێت دەتوانێت وەرگێرانەکەی بەهادارترو بە نرختر بکات. ئەمە ماوەو ئەرکی زیاتر پێویستە ـ لەوانەیە ئەگەر دانەر ماوەی نەبوو چاوەرێی کرد ماوەی لە دەست دەرچێت ـ ئێمەش ئێستا کە هێندە پێویستمان زۆرە وا چاکترە چیمان لە دەست دێت زوو بە زوو بیکەین ـ «عصفور في اليد خير من عشرة على الشجرة» (چۆلەکەیەك لە دەستا لە دە باشترە بەسەر درەختەکەوە) بۆیە

لێرەدا دکتۆر بدرخان درێغی نەکردووە. بەڵام بۆ هەڵی لە چاپدانەوەی کتێبەکەی ئاواتە خوازین ماوەی زیاتری پێبێتو بتوانێت چی کرا بۆ بەجێ هێنانی ئامۆژگارییەکانی دیدارەکەو ئەم چەند تێبینییە بیکات:

١ـ گەلێک پەندیتر لە کتێبەکەیدا وێنەیان هەیە بە عەرەبی ـ وەک بۆ کیف یکون الکبش یکون الحمل، «فرخ البط عوام» ل١٨٧.

٢ـ جارو بار کەوانەی پچووکی (کۆتەیشن مارک)ی بەکار هێناوە بەڵام ناوکەوانەکان دەق نین کورتە یان واتان. بە تەنها لابردنی ئەو کەوانانە کێشەکە نامێنێت. وەک پەندی شەشەمی لاپەرە(٢٠).

٣ـ چەند پەندێک لەوە دەچێت دەقی هێندێک وشەیان جیاواز بێت نەبوونی دەقەکە بە کوردی لە کتێبەکەیداو لەوانەی پشکنین دەمانخاتە گومانەوە. وەک ایها الجدار احدثك وایها الکنة اسمعي، وابزانم لە جیاتی الجدار (خەسوو)ە الحماة. ل١٧٢.

٤ـ چەند پەندێک واتایان روون نییە لەوە دەچێت وشەی، هەڵەی چاپدانی تیابێت. وەک: «کان احدهم لا یستطیع مصارعة خصماً واحداً» ل١١٩ و ل١٢٠ «خیر الخیر لقی شرا من احد الخصمین»؟. هێندێکیشیان بە هەمان واتا وەرنەگێراون وەک ل(٢٠٠) السارق یشك بنفسه ئەگەر بۆ (لە دزوایە هەموو کەس دزە) بێت دەبێت بکرێت بە (السارق یظن ان کل الناس سراق)..

## سەر ئەنجام

باو باپیران کاتی هێشتا نووسین نە زانرابوو مێژووی نەتەوەکەیانو گەلەکەیان بە زاری بە شێوەی چیرۆک، کورتە چیرۆک، شیعر، شیعری چیرۆکی، بەلاد، مەلحەمە ـ گۆران ـ لاوانەوە ـ لایلانە ـ سەرگوزشتە..

وپەندوتەی (پێشینان) بڵاودەکردەوەو هەر بەو جۆرەش لە وەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکیتر و لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیتر دەمایەوەو دەپارێزرا... لەمانە پەندی پێشینان لەگشتیان زیاتر ناوبانگی دەرکردووەو باشتر پارستراوە و بەسەر گشت دەمێکەوە بووەو هەمیشە بەکار هاتووە چونکە شێوازێکی تایبەتی هەبووە؛ کورتی رستە، خەستی واتا، رێکخستنی گەلێکی بەجۆری شیعر بەترپەو کێش یان (سجع)... ئەمە بۆتە هۆی لەبەر کردنیان بەئاسانی و لە بیر نەچوونەوەیان...

گشت گەلێک و نەتەوەیەک پەندی خۆی هەبووەو هەیەو بە درێژایی مێژووی بەکاری هێناوەو پاراستوویەتی ـ لە سەدەکانی (١٩ـ٢٠)دا بایەخێکی تایبەتی دراوە بە کەلەپووری گشتیو بە پەندی پێشینان بە تایبەتی و ئەمە بەشێکە لە کەلەپوور.. لە هەمان کاتدا گەلێک زانایانی تایبەتی ئەم بابەتانە لە رۆژهەڵاتناسەکان وەک هی یەکێتی سۆڤیەتی جاران و بە تایبەتی ئەرمەنییەکان کەوتوونەتە کۆکردنەوەی هێندێک کەلەپووری کوردی وشی کردنەوەیانو چەند کتێبێکیان لەم بارەیەوە لەچاپ داوەو بڵاوکردوتەوە. پاشان چەند لەوانەی لە ناوچەی کوردستان ژیاون وەک مێجەر نوئێلو یاخود بەرهەمی زانایاران تریان دیوە لەم بابەتەدا وەک رۆژیە لیسکۆ بە هۆی بدرخانییەکانەوە، کتێب یان بابەتیان بەرهەم هێناوە سەبارەت کەسێتیو کەلەپوورو پەندی پێشینان کورد. لە کوردەکان خۆمان بۆ یەکەم جار مەلا محمود بایزیدی لە پەندەکان کۆکردوتەوەو نووسیونیەوە. لە عیراق یەکەم کەس مامۆستا اسماعیل حقی شاویس لەم بوارەی داوە وکتێبی (قسەی پێشینان)ی داناوە.

لەبەر مەترسی فەوتانو ون بوونی پەندەکان لەمەو دوا، چونکە وەک جاران بەکار ناهێنرێن، گەلێک نووسەرانتر کەوتوونەتە پشکنین و لێکۆڵینەوەو دانانی کتێب، بۆ پاراستنی ئەم پەندانە کە رادەی بیر و باوەری باو باپیرمانو بە شێکن لە کەلەپووری نەتەوەکەمان و رادەی پێگەشتنو تێگەیشتنو روشنبیری و ژیری پیشان دەدەن، هەروەها مێژووی خەباتو چالاکیو سزاو ئاسۆری و دەستورێکن بۆ وەچەی تازە کە لە سەری بڕۆنو لە رووناکیدا هەنگاو هەڵبهێنن بەسەر پلەکانی ژیانیاندا.

جا هەر نووسەرە کتێبێک دانێت لەم بوارەدا بەشی خۆی (خزمەتی) رازگەی نەتەوەکەی دەکاتو بەشداری لە پاراستنی کەلەپووری. بە پێی مێژووی دانانی کتێبەکان تائێستا ـ کتێبی (الحکمه الکردیه)ی دکتۆر بدرخان سندی دوامین کتێبە سەبارەت بە پەندی پێشیان کورد.

پاش بەسەرداچوونێکی کەم ناو پشکنینێکی خرا پە ناو لێکۆڵینێکی بەپەلە پەل ناو شی کردنەوەیەکی باش، بۆ سەلماندنی نرخی ئەم کتێبە کە بە بە شداریم لە گوێ گرتن لە وتوویژی دیدارەکەی بانەی الجمهوریە لە لایەن ئەم کتێبەوە هەستم کرد کە کتێبەکە زۆر لەوە بایەخدار و بەهادارتر و بە سوود و بە نرخترە کە باسکرا، ئەم باسو لێکۆڵینەوەیەم ئامادە کرد، بە ئومێدی ئەوەی یەک ئەم راستییە بخەمە بەر چاوو دوو نرخی راستی ئەم کتێبە بۆ پاراستنی ئەم بەشە لە کەلەپوورەکەی بزانرێت، تا نووسەرانو مێژوو ناسو دانەرانی تریشمان وەک خوالێ خۆشبوو شێخ محمدی خاڵ وتوویەتی «قوڵی لێ هەڵکەنو کوردانەو مەردانە» بکەونە کۆکردنەوەی چیتر هەیەو نووسینەوەیانو پشکنینو لێکۆڵینەوە بۆ زانینی مێژووی دانانیانو دانەریان چونکە گەلێک مێژووی خۆی نەزانێ وەک منداڵێکە کەباوکو دایکی خۆی نە ناسێت.

لە کۆتاییدا دەڵێم هەر بژین گشت ئەوانەی درێغی ناکەن لە بوژاندنەوەو پاراستنو گەشەپێدانی مێژووی گەلو نەتەوەو نیشتمانیانو هەمیشە هەر ئەستێرەی درەوشەدار بن لە ئاسۆی وڵاتەکەماندا بۆ روون کردنەوەی رێگەی ژیانی وەچە تازەکانمان..

## پەراوێزەکان

١ـ (خاڵە) پیرەمێرد ـ حاجی تۆفیق لە خێزانی هەمزە ئاغای (مصرەف) بووە هەمان خێزانو خێڵی بنەچەی (بنچینە)ی رەفیق حیلمیو خێزانەکەی و خێزانی پیرەمێرد بووری ژنی مامۆستا رەفیق حیلمی بووە (خوشکی باوکی کە

ئەنکی کاک فائق هوشیارە. لەبەر ئەوە هاتوو چومان بۆ مالی پیرەمێردو هی ئەویش و خێزانە کەشی بۆمان زۆر بووە - و هەموو شمان گەورەو بچوك پێمان دەوت (خالە). بڕوانە باسی (منو خالە پیرەمێرد) نووسینی ئاخێلە رەفیق حیلمی لە رۆژنامەی هاوکاری دا..

٢- بڕوانە کتێبی (دراسە ف الشعر الکردی) دانەری بە فەرەنسی لوسی پۆل مارگریتو ك. أ. ب (بدرخان) پاریس ١٩٣٧ بە ناوی **Une etude Sur La Poesie Kuyde** مامۆستا رەفیق حیلمی لە فەرەنسیەوە کردویەتی بە عەرەبی ١٩٣٩ ل (٩) لوسی پۆل وتویەتی کە (الاب) (پۆل باپندمر) لە کتێبی (صرفو نحوی کوردی)] خۆی کە سالی ١٩٢٥ لە پاریس لە چاپی داوە وتویەتی: «زمانی کوردی زمانێکی خۆشە تر پەو کێشی هاوسەنگی هەیە.. زمانی کورد پەندی قەشەنگی زۆر بەکار هاتووی تێدایە - ئەو پەندانەی بنەمای گشت گفتوگۆکانو بڕبڕەیانن و بەڕاستی لە گرنگترین تایبەتمەندێتی زمانی کوردیە. و دکورد پەندێکی هەیە بۆ گشت شتێکو بۆ گشت بابەتێك و لەم پەندانە بەشێکن لە ژیانو ژیری (زیرەکی کوردو بەوە کورد توانی هەستی بەرامبەر گشت شتێك لە سەر وشادەر بڕیتو رەوان بێژی لەم زمانە لە فەلسەفەی کەمتر نیە.. هتد..

بڕوانە ل ١٠ بە عەرەبیەکەی «فالکردی مثل لکل شيء وکل موضوع وهذه الامثال هی جزء من حیاتە والاکاه الکردی قد مکن الاکراد من التعبیر عن کل شیء فی الطبیعە ولا تقل بلاغة هذه اللغە عن فلسفتها»..

٣- بانەی - نادی جمهوریە - لە کۆشکی رۆشنبیری کۆبونەوەیەکی سازکرد بوو بۆ سەلماندنی کتێبی (الحکمة الکردیە)ی دکتۆر بدرخان سندی رۆژی پێنج شەممە ٢٥/ك١/١٩٩٤.

بانەکە هی رۆژنامەی (الجمهوریە)یە

- بڕوانە رۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٣٠٠١)ی رۆژی چوارشەممە ٢١/ك١/١٩٩٤ بۆ بلاو کردنەوەی (بۆزانین)ی ئەم کۆبوونەوەیە دکتۆر حسن جاف دیدارەکەی برد بەڕێوە.. لە مامۆستایان بەشداری لێکۆڵینەوەو شی کردنەوەی کتێبەکەیان کرد - مامۆستا عروس و مامۆستا سالم الآلوسی.

٤- شێخ محمدی خاڵ پەندی پێشینان ل (٩)

٥- هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

٦- هەمان سەرچاوە لاپەڕە (٥).

٧- فەرهەنگی عەرەبی ئینگلیزی (قاموس الیاس) (المصری) الیاس انطوان الیاس وادوار الیاس **modern Dictionary** وکتێبەکەی (الحکمة الکردیە) د. بدرخان سندی.

٨ - قاموسی عەرەبی ئینگلیزی سەرەوە. قاموسی ئینگلیزی ئینگلیزی وێبستەر دیکشنەری - مۆدرن دیکشنەری. و چەندی تر.

٩- بڕوانە گۆڤاری (الادیب الکردی) ژمارە (٤) (نووسەری کورد) ئاب ١٩٩٢ لاپەڕە (١٦٨).

١٠- پەندی پێشینان، شێخ محمدی خاڵ، پێشەکی کتێبەکە.

١١ -(الحکمە الکردیە)، دکتور بدرخان سندی، ل ٥.

١٢- قسەی پێشینان گوستاو لۆبون - گوتەی مەزنانو فەلسەفی، اسماعیل حقی شاویس ١٩٣٣ ل١.

١٣- «الحکمە الکردیە» (دکتۆر بدرخان سندی) ل٧.

١٤- هەمان کتێب (دکتۆر بدرخان سندی).

١٥- کوردلیسکی: ئەمە دیارە خۆشی کوردە.

١٦- ئوربل: ئایا راستیەکەی (اوربل) بێت؟ لە (ئەربیل)ەوە هاتێتو وردە وردە ناوەکەیان لەبەر پەرینی یاخود زیاد کردنی (نوقطە) خاڵو پیت کاتی نووسین یان خوێندنە وای لێ هاتووە لێرەدا لە جیاتی یەك خاڵ بۆ پیتی (ب) بۆتە دوو خاڵو بەوە بۆتە پیتی (ي)؟

١٧- بۆ درێژەی باسی مێجەر نوئێلو ژیانی لە کوردستاندا بڕوانە (یادداشت)ەکانی خوالێ خۆشبوو مامۆستا رەفیق حیلمی ١٩٥٤-١٩٥٦.

١٨- بۆ رۆژنامەی (هدیە کردستان) هەدیەی کوردستان بڕوانە کتێبی (الحکمە الکردیە)ی دکتۆر بەدرخان سندی - سەرچاکەی و باسی سەرچاوەکانی پەندی پێشینانمان.

١٩- لێرەدا وشەی (سەلماندنمان) لە جیاتی (رەخنە) بەکار هێنا چونکە هەرچەند هەزاران جار دووپات کراوەتەوە کە وشەی رەخنەو رەخنەی زانستی واتای هەر پشکنین هەلەو نیشان کردن نیە - ئەم وشەیە دەبێت گشت لایەنێك بگرێتەوە چاکو خراپو بە مەبەستی یارمەتی دانی نووسەر و دانەر بۆ بەرز کردنەوەی نرخی نووسینەکەی تا خوێنەر زیاتر سوودی لێ وەرگرێت - و نەك توانج و پلار تێ گرتن و پشت شکاندنی و سووك کردنی بەرهەمەکەی ئایا لەبەر مەبەستی تایبەتی رەخنەگر بێت یاخود رەخنەگر هیچ لە بابەتەکە نازانێتو بابەتەکەی تێ ناگات یان بە وردی نایخوێنێتەوە بۆیە دەگەڕێت چەند هەڵەیەکی زمانی بدۆزێتەوەو بیکات بەدەست کەلا تا بڵێن کتێبەکەی خوێندۆتەوەو پشکنیوە. دیسان هەر لەگەڵ دەڵێن (رەخنە - نقد - **Criticism**) هەر بەواتەی (زەم) کردن دێتە گوێمان بۆیە ئاواتە خوازم لە جیاتی ئەم هەموو دووپات کردنەوە بێ سوودەو شەی (رەخنەو نقد) بە جارێك لابرێنو لە جیاتی وشەیەکی تری راستو رەواتر بەکار بێت کە هەردوو لا بگرێتەوە بە جۆرێکی راستەو راست. و لێرەدا وابزانم وشەی (سەلماندن) بە واتای خستنە نای تەرازوو و کێشانی و هاوسەنگی تاکانی یاخود بەرزو نزمیان - چاکی لەلایەکی خراپی و کەم وکورتی لەولای کامیان بەرزترو کام نزمتر ئایا دەتوانین نزمەکە بکەین بە هاوسەنگی بەرزەکە یاخود لەو بەرزتریش لەگەر لای چاکەکە نزم بوو؟ و لەمەشە مەبەستی رەخنەی زانستی، نیشانە کردنی لایەنەکەم کورتیو لاوازی بە مەبەستی راستکردنەوەو بەرز کردنەوەی رادەی نووسینەکە بێتو نەك شکاندنیو ئەمەیش بەجێ نایەت تەنانەت بەوە نەبێت کە رەخنەگر زۆر زۆر توانا بێت لە بابەتی نووسینەکەدا، زانیارێکی فراوانی هەبێت لەو بابەتەدا بەگشتی و زۆر

زۆر بە وردی نووسینەکە یاخود کتێبەکەی رەخنەی لێ دەگرێت و لەم بەرگ بۆ ئەو بەرگ سەیر بکات . و پێش دەست کردن بە ناوەرۆك چی (سەرەتا ، پێشەکی ، پێش دەستی ، ئامۆژگاری ، تێ بینی ، سوپاسی یارمەتیدەران ، لیستەی ناوەرۆك ، لیستەی سەرچاوە جگە لە بیبلیۆگرافیای کتێبەکە) بخوێنێتەوە . چونکە ئەمانە کلیلی ناوەرۆکن - تا بە ئاسانی بتوانێ لە دەرگاکەیەوە بچنە ژوورێ نەك لە پەنجەرەکانەوە بە خێشەخێش .

## سەرچاوەکانی بابەتەکە

١- کتێبی (الحکمة الکردیه) د. بدرخان سندی ١٩٩٠ ز .

٢-(کتێبی پەندی پێشینان) شێخ محمدی خال ١٩٥٧ ز .

٣-(کتێبی قسەی پێشینان) مامۆستا اسماعیل حقی شاوەیس ١٩٣٣ ز .

٤-(کتێبی دراسه في الشعر الکردي) تعریبی مامۆستا رەفیق حیلمی ١٩٣٩ .

٥-(یاداشت)ەکانی مامۆستا رەفیق حیلمی ١٩٥٤-١٩٥٦ .

٦-رۆژنامەی (هاوکاری) ٢١/ك١ / ١٩٩٤ .

٧-دیدارەکەی نادی جمهوریە ٢٥ /ك١ / ١٩٩٤ .

٧-(رۆژنامەی(ژین) چەند ژمارەیەك لە ژماردن نایەن .

٨ - گۆڤاری گەلاوێژ - هیوا - پێشکەوتن رۆژنامەی «رۆژی کوردستان» هتد . . و گەلێکی تر لە رۆژنامە و گۆڤارە کۆن و تازەکانمان چەند ژمارەیەك گۆڤاری کۆڕی زانیاری .

٩-(کتێبی هەزار بێژ و پەند)ی مامۆستا معروف جیاوك ١٩٣٨

١٠- (پیرەمێرد) خۆی ، رۆژنامەکەی (ژین)و کتێبەکەی باسی ژیان و شیعری دەکا .

١١- دکتۆر بدرخان سندی خۆی لە کاتی بەڕێوەبردنی ئیش و کاریدا و لە دیدارەکە و گەلێك دیداری تری ئەدەبی و رۆشنبیری دا . . .

١٢-(گۆڤاری الادب الکردي) نووسەری کورد ژ (٤) ١٩٩٢

# حكمنا وامثالنا وكتاب الحكمة الكرديه

## للدكتور بدرخان سندي

## خلاصة البحث

كان اسلافنا القدماء ، قبل معرفة الكتابة والقراءة ، يتناقلون احداث تاريخهم عبر الإجيال بصورة شفهيه باسلوب قصصي على شكل حكايات وروايات وقصص قصيره . . او على شكل اشعار . . اشعار قصصية . ملاحم ، وقصائد قصيره او طويلة عموديه . . او اغاني . . ثم الامثال والحكم . وهذه اشتهرت اكثر من غيرها لكونها ذات اسلوب خاص يسهل حفظها واستعمالها وعدم نسيانها . فهي قصيرة الجمل ، كثيفة المعاني ، والكثير منها منظمه كالشعر او السجع .

لكل امة حكمها وامثالها ولقد حرصت كلها على حفظها مر العصور ولقد ازداد الاهتمام بجمعها ودراستها وحفظها بين القرنين (١٩ و ٢٠) بشكل خاص كجزء من (الفلكلور) او التراث الشعبي . في نفس الوقت توجه بعض المستشرقين كمستشرقي الاتحاد السوفياتي السابق والارمن منهم بشكل خاص نحو دراسة الفلكلور الكردي وجمع الامثال والحكم الكرديه والتعليق عليها ، ولقد وضع الكثير من الكتب في هذا المضمار كما ان بعض المستشرقين الاخرين كالضباط والحاكم السياسي الانكليزي (نوئيل) (الذي عاش برهة من الزمن في المناطق الكرديه ودرس الشخصية الكردية من خلال حكمهم وامثالهم . و(روژيه ليسكو) الذي تعرف على الحكم الكرديه من خلال اطلاعاته على نتاجات العائله البدرخانيه في باريس وباللغه الفرنسيه . وضعوا بعض الكتب او اعدوا مقالات حول هذا الموضوع .

من الاكراد انفسهم الملا محمود البايزيدي له الدور الريادي في جمع الامثال والحكم الكرديه وتسجيلها لاول مرة . واول من بادر بمثل هذا العمل في العراق الاستاذ اسماعيل حقي شاويس .

ولقد تابع اخرون في متابعة هذه المسيرة خوفا من ضياع الامثال واندثارها فبحثوا عنها ودرسوا وجمعوا الكثير منها في كتب او مقالات للحفاظ عليها لانها حصيلة افكار و اراء ومعتقدات اجدادنا ولانها جزء من تراثنا وترمز الى مدى فهمنا وتقدمنا وسعة ثقافتنا وعمق تفكيرنا وهي كالسنن والقوانين لسير ابنائنا في ظلها والانتقال عبر مراحل الحياة مسترشدين بنورها .

ولهذا فان كل من وضع كتابا في هذا الحقل له دوره في خدمة امته وفي الحفاظ على تراثه القومي .

وبموجب تواريخ وضع تلك الكتب نجد ان كتاب (الحكمة الكرديه) للدكتور بدرخان سندي هو آخر ما نشر في هذا المجال .

بعد دراسة وبحث غير قليل وتحليل وتعليل غير سطحي لتقييم هذا الكتاب الذي بسماعي لبعض الاراء عنه في ندوة (نادي الجمهوريه) في ٢٥ /ك١ / ١٩٩٤ واحساسي بان الكتاب يعني بالنسبة الينا اكثر بكثير مما وصف به والنفع والثمن مما قدر ، اعددت هذه الدراسة املا في ان اولا : أضع هذه الحقيقة امام الاعين وان اعرف القراء باهمية هذا الكتاب للحفاظ على هذا الجزء الهام من التراث القومي ؛ كي يهب بقية كتابنا ومؤرخينا كما قال (الشيخ محمد الخال) لجميع كل ما تبقى من هذه الامثال وتسجيلها والبحث عن تاريخها وقائليها لان اي شعب او قوم لا يعرف تاريخه ، كالطفل الذي لا يعرف ابويه .

# ئایا خواوەندی یەزیدییەکان مەلەکتاوس تەوتەمی بوو؟

د. حسین قاسم العزیز

## سەرەتا:

یەزیدییەکان، کە بەشی هەرە زۆریان کوردن، هەتاوەکو ئێستاش لە باکووری عیراق لە شوێنە شاخاوییەکان دەژین و، هەندێکیشیان لە دەرەوەی عیراق دەژین. دوو کتێبی بەنرخیان هەیە:

١- جلوە، کە شێخ عدی کوڕی مسافر[1] [٤٦٧ك/ ١٠٧٤ز - ٥٥٧ك/ ١١٦٢ز][2] دای ناوە و تێیدا لە بنچوبناوان دێرینی یەزیدییەکان دەدوێ[3].
٢- ئەوی تریان «کتێبی ڕەش»ە[4]. هەر دوو کتێبەکە بە زمانی کوردین.

یەزیدییەکان لەو باوەڕەدان، کە «مەلەک تاووس» خوای شەڕ (شەیتان)ە، بۆیە دەیپەرستن و ڕێزی لێدەگرن و لێی نزیک دەکەونەوە و، قوربانی پێشکەش دەکەن. یەزیدییەکان لەو دوو کتێبە بەنرخەدا، زۆر ئەفسانە و حیکایەتی نووسراوەو و نەچنی (ئەخبار)ی دەمادەم گێڕراوەیان بۆ بەجێماوە.

یەزیدییەکان جەژنی دێرینی خۆیان هەیە، کە بەناوبانگتریان جەژنی «سەری ساڵ»[5]ە، ئەوانی تریش ئەو جەژنانەن کە بەلاسایی و تورێنە جەژنی موسڵمانەکان و مەسیحییەکان وەریانگرتووە، چونکە دراوسێی یووننو چاویان بڕیوەتە نەریتی کۆمەڵایەتی یەکتری.

زاناپانو توێژەرەوەکان لەسەر ناونانی بنچینەی خواوەند (مەلەک تاووس)، بیروڕاو بۆچوونی جیاوازجیاوازیان هەیە. لەبەر ئەوە گەلێ بۆچوونو بیروڕای پچڕپچڕ هاتونەگۆڕێو ناتوانرێ بەتەواوی پشت بەهیچ لایەکیان ببەسترێ. بەڵام بەپێی بۆچوونو چارەسەری خۆم - لەدوا لێکۆڵینەوەو، چوونەخوارەوە بۆ قووڵایی کێشەکە لە ڕابوردوویێکی فرەکۆندا، لە هەرێمی باکووری عیراقو ئەو هەرێمانەی کە دراوسێی بە عیراقنو بەگەڕان بەدوای ڕەگە ئەفسانەییەکان داستانی نەورۆزدا، بۆم روون بۆتەوە، کە هێشتاوەکو زۆر بابەتی گرنگە هەیە بە گیانێکی زانستی چارەسەر نەکراوەو، بیروڕایێکی نەبچڕی بە بەڵگەو مەتین دارێژراو، لەسەر ئەمە نەهێنراوەتەکایەوە. هەتا بتوانرێ کێشەکەی لەبنەڕەتدا بێ چارەسەر بکرێ. جاری لەوتۆ هەیە بیروڕاکان لێڵو نادیارن، سەرچاوەکانیان دەربارەی شوێنو کاتی پەیدابوونو گۆڕینی بوونەی زیهی داستانی نەورۆز لێخنن.. هەروەها ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بە بنچوبناوان کوردەکانو سومەرییەکانەوە هەیە، سەبارەت بەوەی کە ئەمان ئەوەی لەپێشەوەداهێنەرانەن لە سازدانی وێنەرێژی (تصورات)ی ئەفسانەییدا (Fantastic). هەروەها لە سازدانی باوەڕگەو ئەفسانەکانیاندا..

لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی باسەکەدا، گەیشتمە ئەوەی کە سەرچاوەی داستانەکە، بەستراوە بە ئەفسانەی خواوەندی سومەری (دموزی)و، دەرکەوتنی لە سەری ساڵی سومەری «زاگموك Zagmok»و خواوەندی تەموزی بابلییەکان لە جەژنی سەری ساڵی «ئەکیتێ - Akitu» بەبیرو خواوەندی «تاوز»ی سوریەیە حەرانییەکانو خواوەندی «مەلەک تاووس» لە جەژنی سەری ساڵی یەزیدییەکاندا.. وە کۆتایی هاتنی بە سەرکەوتنی کاوەی ئاسنگەر بەسەر زوحاکو گەڕانەوەی تەختو تاج بۆ لەڕیشون..

گەرچی چارەسەرکردنی کێشەکەمان لێرەدا بە سفتیو بەرفراوانی پێنەکراوە، هەڵمانگرتووە بۆ دراسەیێکی قووڵتر لە داهاتوودا.. وە واش بۆی چووین، کە خواوەندی یەزیدییەکان «مەلەک تاووس» لە پاشماوەی (بقایا) تەوتەمی پەرستەوە سەری هەڵداوە (هاتوتەدی). ئەمەش پێویستی بە لێکۆڵینەوەو خستنە ڕوویێکی بەرفراوان باوەڕە دێرینە سەرەتاییەکان هەیە. ئەشمانتوانی لەمەش ئەنجام بدەین، چونکە ئەم کورتە باسەکە هەر ئەندەی بە بەرەوە بوو..

ئاهەنگگێڕانی گەلانی هەرێمەکە (عیراقو، باکووری سووریاو، ڕۆژاوای ئێران) بەبۆنەی جەژنی سەری ساڵەوە لە بەهاری هەموو ساڵێکدا. (لە سەرەتای مانگی نیساندا، کە بە مانگی یەکەم دادەنرێ لە ساڵنامەی هەموو ئەو گەلانەدا). لەم جەژنو ئاهەنگەش بەخۆشی بەربوونی خواوەندی ئەفسانەیی، یان ئارەمانێکی خوراکی داماوو کەساسی ئازاردراوەوە دەگێڕدرا (دەکرا)، کە لە سەرەتای گۆڕانی وەرزی بەهاردا بەرەڵڵاکراوەو ئازادبووە.. سەرەتای ئاهەنگەکە لە باکووری عیراقەوە - لە ناوچە شاخاوییەکانەوە، دەستی پێکردووە.. لەم بۆچوونەشمدا، پشتم

بە بەڵگەی زانستی و باوەڕی مەتیفی پەسەندو وە، سەبارەت بەوەکە ئەم هەرێمی لە سەدە دێرینەکاندا، لە هەموو هەرێمە کۆنەکانی تری عێراق چڕتر بووەو خەڵکێکی فرە دێرین و سەرەتایی تێدا نیشتەجێ بووە. ئەمجا لەبەر ئەوەی کە ئەو خاکو بابە (ژینگەیە) لەبار بووە بۆ خۆراکی ڕووەکی و گیانەوەری، ئەو خەڵکە سەرەتاییەی کە بە کۆکردنەوەی شمەکەوە بەڕێوەچوون، لەسەری ژیاون و گوزەرانیان کردووە جگە لەمەش ئەشکەوت و کەلەری سروشتییان بەدەست کەوتووە کە تێیدا هەڵبکەن و لە کاتی سەرماو گەرمادا ڕووی تێبکەن، وەك ئەشکەوتی: شانەدەر، هەزارمێرد، زەرزی، جرمو... هتد. لەنێو ئەو ئەشکەوتانەدا پاشماوەی ئیسقان و هەندێ شوێنەواری دۆزراوە، هەڵکۆڵینی زەوی و لێکۆڵینەوەی شوێنەوارناسەکان، وەك گارروود سولیکی، سپایزر، مورنکان، ستون لوید و چەندانی دی، ئەوە دەگەیەنن کە مرۆڤ بەرلەوەی زنجیرە گۆڕانێکی جیدی هێدی بەسەردا هاتبێ، لەو شوێنانەدا ژیاوە..

کاتێ کە خەڵکی کۆمەڵ کۆمەڵ لە چیاکانەوە دادەکشان بۆ ناو دۆڵەکان و لە کۆمەڵگای بچوکدا نیشتەجێ دەبوون ـ ئەو کۆمەڵگایانە بە کۆنترین گوندی جوتیاری دادەنرێت لە گێتیدا. بەتایبەتی لەدوا ئەوەی ئەو کۆمەڵگایانە توانیان هەندێ ڕووەك بڕوێنن و هەندێ گیانداری کێوی دەستەمۆ بکەن و فێری کشتوکاڵ بین و بەشی خۆیان خۆراك پێکەوە بنێن.

لەپاشا باوەڕ بۆ ماوە پشتاوپشتەکانیان لەئەك ئەو ئەفسانەو ئاهەنگە بەهاریەی کە بە بۆنەی جەژنی سەری ساڵەوە دەگێڕدرا، لە ڕێی ئەوە باکووریەکانەوە بگوێزرێتەوە ـ ئەو ئەوانەی (وەچانەی) کە لە هەرێمە شاخاویەکانەوە لە باکووری عێراقەوە ڕوویان کردە هەرێمە دەشتیەپڕ لە زەلکاوەکان لە دەشتە نیشتوەکەی خوارووی عێراق، کە ناویان نا وڵاتی، یان زەوی سۆمەر [کی ـ ئین ـ گی Ki-en-gi] زەوی دەوەنو بێشەڵان.. ئەوراتیش پێی دەبێژی «خاکی شەنعار».

سۆمەریەکانیش بەردەوام بوون لە بەجێهێنانی ئاهەنگی جەژنی سەری ساڵی «زاگموك Zagmok»، هەر ئەو ئایین و هێماو ڕەوشتانەیان بەکاردەهێنا، کە لە ئەوەبێ باکووریەکان و سۆمەریەکانەوە وەریانگرتبوو، چ بە لاسایی کردنەوە، چ بە وەرگرتن، چ بە کارتێکردن..

ئەوجا ئەوان لە جەژنی سەری ساڵی یەزیدیەکان (سەری ساڵ)و باسکردنی کاتەکەی و خواوەندی هێنا «مەلەك تاووس»، کە لەم جەژنەدا لەسەر زەوی بەدەرکەوت ـ وەك «کتێبی ڕەش» بۆمان دەگێڕێتەوە، بۆ ئەوەی «موسا» و قەومەکەی ـ عیبرانیەکان، لە زوڵم و زۆرداری فیرعەون و هێزە چەپەڵەی ڕزگار بکات و فریایان بداتە دەریاوە (دەریای سوور).

یەزیدیەکان لەو باوەڕەدان، کە «مەلەك تاووس»ی خواوەندیان، خواوەندێکی ئازاردراوە، خوای خێر و خۆشی دووری خستۆتەوەو لای بردووە، ئەمە، بەپێی تێڕوانینی ئەوان ـ وەك مامۆستا الحسنی دەبێژێ: «فریشتەی دەرکراوە»[1] و خوای شەڕ (شەیتان) دەنوێنێ. لەبەر ئەوە بە لایانەوە ناخۆشە، ناوی شەیتان بهێنرێ.

وەك لەمەوبەر گوتمان، بەپێی بۆچوونی ئێمە ناونانەکە پەیوەندی بە جەوهەری خواپەرستی یەزیدیەکانەوە هەیە، کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی هەرە دێرین لە ڕابوردوودا. ئەمە ـ پاڵ بەڕەتو سەرهەڵدانی ناونانی «مەلەك تاووس»ە، بەپێی بۆچوونی خۆم دەگەڕێتەوە بۆ ئەوتەمی و مەلەك تاووس لە ڕابوردوویێکی هەرە کۆندا تەوتەمی کۆمەڵەیەك بووە، کە باوەڕیان بە ئاینە سەرەتاییە کۆنەکان هەبووە. تەوتەمەکەیان گۆڕدراوە، سەبارەت بەوە کوشتن و ناوهێنانی حەرام بووەو ناتوانرێ لە گۆشتەکەی بخورێ، مەگەر لە ئاهەنگێکی تایبەتی بە کۆمەڵدا نەبێت، بۆ ئەوەی بچێتە ناو لەشی هەموو لایەکەوە ـ هەتا هەموویان وەك یەك خێری لێ ببینن..

توێژینەوە لە باوەڕگە سەرەتاییە کۆنەکان بە پەرت و بڵاوی کارێکی گرنگ و پێویستە بۆ ئەو چارەسەرانەی کە ئێمە بەدوایدا وێڵین و دەمانەوێ شتێك لەم بارەیەوە هەڵبکرێنین..

## ئەوەڵیاتی ئایینی سەرەتایی و ئەو ئاڵو گۆڕانکاری یەی کە بەسەریدا هاتووە

بیروڕای بەشی هەرە زۆری زاناکانی کۆمەڵایەتی و ئەنثرۆپۆلۆجیاو، ئەنثرۆلۆجیاو، مێژووی کۆنو ئایینە بەراوردکاریەکان لەسەر ئەوە پێکهاتوون، کە ئایینی سەرەتایی بە خوێی و هەردوو بەشەکەیەوە «باوەڕگەکان و تەتیقاتەکان» وەك یەك، نەتوانراوە لەلایەن ڕەگەزی بەشەرەوە لە هیچ پارچە زەوییەکی ئەم سەر زەمینەدا ـ گەرچی بە سوکترین شێوەش بوو بێت، پابەندی پێدرێت و بەکاربهێنرێت.. لەو زینجیرەی بەشەرییە سەرەتاییانەوە، لەوانەی کە لەسەر ئەستێرەکەمان (زەوی) لە شێوەیێکی سەرەتایی و کێوی و ناشی و لە تاریکیدا ژیاون، هیچ شتێکیان دەربارەی ئەو باوەڕگەو تەتیقاتە ئایینیانە ـ بە هەزاران ساڵ لەمەوبەر، نەزانیوە.. مرۆڤی یەکێن (سیانثروب)، کە سەرهەڵدانو هاتنەگۆڕێی بە نیو ملیۆن ساڵ پ.ز دادەنرێ، بە کۆنترین دەستە مرۆڤ ناودەبرێن، کە ئیسقان و هەندێ شوێنەواریان دیتراوەتەوە (دۆزراوەتەوە).. هەروەها مرۆڤی جاوە (پیثکانثروب).. وێنەڕێژی (ئەسەوراتی) باوەڕگەیی هێشتاوەکو لە نێو ئەو دوو کۆمەڵەدا سەری هەڵنەدابوو، بەڵام مرۆڤی

نیاندرتال ـ مێژووی سەرهەڵدانی بە زۆری دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سەهۆڵبەندانی دووەمین [١٠٠/٠٠٠ ـ ٤٥٠/٠٠٠ پ. ز]، لەتەك سەرهەڵدانی هەندێ سەرەتای ڕێنەریزی باوەڕگەیی ساویلکە (ساذج) کەوتەکاییەوە، مرۆڤی ئەشکەوتی شانەدەر [٥٠ ـ ٦٠ هەزار ساڵ پ. ز] دەگەڕێتەوە بۆ هی کۆمەڵە مرۆڤێکی نیاندرتاڵ، لەپاشا ئەم باوەڕە نەبەکامە پەرەیەوە کەوتە گەشەو گۆڕان لە سەدەی مرۆڤی نوێدا، کە بە مرۆڤی ژیر ناودەبرێ (Homo Sopiens)و لە سەدەی بەردینی نوێدا، کە مرۆڤی کرۆماتیۆن [CRO- MAGNON] وێنەیەکی ئەو دەورەنەو سەرهەڵدانیان لە نێوان (٤٠ ـ ٣٠ هەزار ساڵ پ. ز) تێناپەڕێ. .

لەپاشانو لە سەردەمی ئەم جۆرە مرۆڤانەدا، هەندێ زیندەوەرو گیان لەبەرو ڕووەکی کێوییو دەشتەکی ماڵی کرانو لە زەوییوزاردا چێنران (لە دەوروبەری ١٠ هەزار ساڵ پ. ز). ئەوجا ئەم مرۆڤە ژیرو بەسەلیقەیە ـ دەستیکرد بە بەرهەمهێنانی خۆراکی خۆی هەتا پێیەزێو لە کۆڵ خۆراك خرکردنەوەو گەڕان بەدوایدا بێتەوە. لەدوای ئەوەی کە توانی بەئەواوی ئەو ئامێرانەی کە پێویستی پێی دەبێت لە کارەکەیدا، دروستی بکات. .

هەرچەند نەشیتوانی بکاتە پۆیەی سەرکەوتن لە بەرهەمهێنانیدا ـ هەتا بەتەواوی دەستی نەدایە کارکردنو جوڵە. . . دیارە ئەو کارکردنە، گەڵەی بە مێشکیداو، ئاسۆی بیرکردنەوەی ڕەهاکردو لەبەری کشتوکاڵو بە خێوکردنی زیندەوەر (زیندەماڵ)و پیشەو بازرگانو نووسینو هەندێ سەرەتای زانیارییو زانست بوو، وە گەیشتە پلەی ژیاری (حضارة)و شارستانی. .

توێژینەوەی ئەنتروپۆلۆجیاو، ئەتنۆلۆجیا هێنایانەوە کەن، کەگەلان سەرەتایی گێتی ـ بەبێ جیاوازی، ڕێنەریزیو باوەڕگەیی ئەبەکامیان تێدا دەرکەوت. . بەڵام لەبەر لاوازیو نەتوانینیان دژی سروشت بوەستن، پەنایان بردە بەر خەیاڵ بەپێت هەتا یارمەتیان بدات لە دروستکردنی ئەفسانەو خەراڵیاتدا. . خەیاڵ بە ناپابکارییەوە کەوتە گەشەو، سەرهەڵدان لەلای ئەو گەلە سەرەتاییانە ڕێنەریزی لەئتازی پێکهات دەربارەی دیاردە سروشتییەکانو ڕەگەزە مادییەکانو هەر شتێ، کە دەوروبەری ژینگە سەرەتاییەکان گرتبوو، هەروەها لەو سەرچاوە ڕووەکیو زیندەوەرانەی کە ڕاویان دەکردنو لەسەری دەژیان. . فرەیزەر ئنگلیز نووسیویەو دەڵێ: وتایین لە سەدە سەرەتاییەکاندا پەیدابوو، لە ڕێنەریزەکان مەردمی گێلو نەزانو بیرلێڵو هیچ لەبارا نەبوو، دەرحەق بە سروشتی خۆیانو دەربارەی ئەو سروشتە دەرەکییەی کە لە هەموو لاوە دەوری دابوون»[3].

ئەو گەلە سەرەتاییانە، باوەڕیان بەوە هێنا ـ بەهۆی ئەندێشەی ناپابەرێزەوە، کە هێزەکانو دیاردە سروشتییەکان چواردەوریان داوە، هێزێکی جادوویی لە هەستەدەری میتافیزیکی هەیەو زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا، لەبەر ئەوەو لە ئەنجامی لاوازیو گێلی خۆیانەوە ـ بەپێی باوەڕی خۆیان، ئەو هێزە میتافیزیکییە دەتوانێ دەستیان لێوەشێنێ. . لەبەر ئەوە لێی دەترسان نەکو دەستیان بۆ بەرێو زەبرو زەنگیان لەتەکدا بنوێنێ. . .

بۆ بەربەستی ئەمە هاتنو پاسایێکی تونتوتیزیان دەربارەی خوارەدنو کردنیان بۆ خۆیان دانا (ڕێیان لە هەوسەری یەکگوشی گرت. . ڕێیان لە ژنهێنان لە خزمو خوێشو خوخێڵ گرت (ENDOGAMY)، تەنیا ڕێیاندا ژن لە بێگانە (Exogmy) بهێنن[4]. . سەرهەڵدان. ئەم باوەڕە ناکامڵە بەستراوە بە زۆری پێشکەوتنی مرۆڤو هوشیاری مرۆڤی نوێوە، مرۆڤی ژیر (Homo Sopiens) لە کارو کردەوەو ژیانی کۆمەڵایەتیدا، لەدوای ئەوەی هێزی مێشکی کەوتە گەشەکردنو لەنگەرگرتن. . توانای مرۆڤ لە بیرکردنەوەی ڕووت ـ دا، کەوتە دەرکەوتن، لە خەیاڵ کردنەوەدا، لە ئەفتازیدا، کە بەبێ ئەوانە ناپابکاری (الابداع) نایەتەدی. بەڵام بە هۆی کەم توانایی و ناشێوەیی کەم شارەزایی لە کارکردندا، دەبوو کاری ئەفتازی لە واقیع دوور بخرێتەوە، ئەمەش بوو بە هۆی ئەوە جیاوازییەك بکەوێتە نێوان ئەو سوورە خورافییەکانەوە، سەبارەت بەوە کە کارێکی واقیعەو کار لە چارەنووسی مرۆڤ دەکات[5]. .

لێکۆڵینەوە زانستییەکان وا دەگەیەنن، کە کەلەسەرەتایی ـ یەکان، گەیشتوونەتە چوار شێوە لە بیرو باوەڕی ئاییندا، وە ئەم شێوانەش لەنێو ئەو گەلانەدا ترنجاونەتە ناویەکترو، جوێکردنەوەیان لەیەك دی، تۆزێ گرانە چونکە بەرەو ماددی، خەیاڵەکانیان خۆی لە خۆیدا جوێجوێیە، بە هەر حاڵ ئەمە هەر چوار شێوەکەیەو یەکە یەکە لێیان دەدوێین:

## ١ـ شێوەی جادوویی (Magical):

ئەم شێوەیە دیاردەکانو هێزەکانی سروشت بە وێنەی میتافیزیکی لێکدەداتەوەو هەوڵ دەدات ئەم هێزە سروشتییانەو دیاردەکان بەپێی ئارەزووی مرۆڤ بخاتە بەر بار، وەك هندییەکان ئەگەر باران نەباریو هاوای باراناباریین لە خوای گەورە بکەن، دەهێنن سەربانی خانووەکانیان بە ئاو، ئاوڕشێن دەکەن. .

هەروەها کوردەکانیش ئەگەر هەر ساڵێ، لە هەر ناوچەیەکی وڵاتەکەیان ـ بەتایبەتی گەرمیان، درەنگە بباری، دەهێنن بووکێ دروست دەکەنو دەیڕازێننەوەو جلەبەرگی گوندەکە، یا شارۆچکەکە بە خۆیانو منداڵەکانیانەوە بووکەکە هەڵدەگرنو دەچنەدەرێو لە خوای مەزن دەپاڕێنەوە، کە بارانیان بۆ بباریێنێ هەتا دەغڵەکانیان وشك نەبێت، زۆر جارو دەستبەجێ ئاواتەکەیان هاتۆتەدی. بەم بووکە دەڵێن: (بووکە بە بارانێ). . (گۆڕەر).

## ب ـ فتیشی (Fetishism) :

فتیش شتێکی وشک و نەبزێوە، کەلە سەرەتاییەکان باوەڕیان وایە، کە فتیش توانای جادوویی تێدایەو دەتوانێ بۆ پاراستنی خاوەنەکەی و بەرەنگاری بەکاربهێنرێ. . وە لە دوایی‌دا دەگۆڕدرێت بۆ بتپەرستی، وەك [خواوەندەکانی عەرەب: یەعوق و یغوث و هتد: . ]، تۆفیتش لەناو عەرەبە بتپەرستەکاندا، ناو و نیشانەیەکی هەبووە، هەروەها (خرزە)ش و (تەمیمە)ش . . کە بریتییە لە موورووی، یان کوزەکەیەك، یان شتەکێکی دی لەو جۆرە، دەکرێ بە ناوشانی مرۆڤدا، یان سەر باڵ و قۆڵدا، یان هەر شوێنێکی دیدا بۆ پاراستنی لە چاوی پیس و بەد، یان گیانی شەڕانی و زیانی. .

هەتا ئەمڕۆش موورووو کوزەکەی شین و دانەگورگ و بەرخورو، پیرۆزە، هۆیەکی پارێزەر و بڵاوە لەنێو مرۆڤدا، وەکو دیاردەیەك خۆی دەنوێنێ لەناو کۆمەڵ، یان جەماوەری دواکەوتوودا . . چونکە پاشماوەی باوەڕە تایبەتییەکانی سەردەمە کۆنەکانی (فتیش)ە . .

## جـ ـ تەوتەمی (TOTEMISM) :

تەمیش، پەیوەندی بە باسەکەمانەوە هەیە، ئەم ناوەشمان لە وشەیەکی هندی ـ ئەمەریکییەوە هاتووەگۆری و واتای ڕەگەز، یان خێڵ دەگەیەنێ. هەروەها پەیوەندی تاکەتاکەی تەوتەمێکی دیاریکراوەو پێچەسپت بە وەچەیەکی هاوبەشەوە دەگەیەنێ لەوە دەردەخات، کە ئەو تەوتەمە تایبەتە بەوان (واتە بەو خێڵە، یان ڕەگەزە) . . پەیوەندییەکەیان، پەیوەندیی (صلاقە)ی بە خوێنەوە نییە، واتە بە هۆی خوێنی خوێشایەتییەوە نەبەستراون بەیەکەوە، بەڵکو پەیوەندییەکەیان لەنێو یەکتردا لە ڕێی جادووییەوە هاتووەو بە تەوتەمەکەی خۆیانەوە (گیاندار بێت، یان ڕووەك) دەبەستێتەوە.

باوەڕی تایبەتی لە تەوتەمیدا، تەنیا هەر گیاندار، یان ڕووەك دەگرێتەوە لە شێوەی جادووداو بە باڵادەستی خێڵ (سەرگەورەی خێڵ)و پارێزەری، پێشکەشکەری خێر و بەرکەت و شادی دادەنرێ. . تەوتەمەکە دەکرێتە هێما بۆ خێڵ، یان هۆزێك و لەلایەن ئەو خێڵ و هۆزەوە لە شێوەی (بت)دا، دەپەرسترێ و دەچێتە شێوەی ئەو گیاندارە، یانیش ڕووەکەوە، وەك تاووسی یەزیدییەکان، کە لە شێوەی باڵندەیەکدایە . . وە هەندێ لە هندییەکانی ئەمەریکا، کۆڵەکەیەکی تەوتەمی (Totempole) لەبەر ماڵەکەی خۆیاندا دەچەقێنن، کە بە نیگاری تەوتەمی هەڵکۆڵراو، یان وێنە کێشراو ڕازێنراوەتەوە. سەرهەڵدانی بیر و باوەڕی تەوتەمی پەیوەندی بە دەرکەوتنی هەنگاوی پاسای خێڵایەتی و هۆزایەتییەوە هەیە لە هەنگاوی خۆراك کۆکردنەوەو ڕاو و شکاردا[٢٠].

تەوتەم وەك خواوەند ناپەرسترێ، بەڵکو بە باوەڕگە، یان خوێشێکی پیرۆز، یان برایەکی مەزن، یا هەر شتێکی بە ڕێزی دی ـ وەکو لەمەوبەر گوتمان، دادەنرێ. لە تەوتەمیدا، [تابو Taboo] کە بە بەچەوشەیەکی پولینزی ـ مالیزییە ڕێ لە خەڵکی ڕەش و ڕووت دەگرێ، کە شتەکی پیرۆز ـ تایبەتە بە گیان و خواوەند، بخۆن و ڕێنادا تەوتەم بکوژن، یان بخۆن، مەگەر لە هەندێ کاتی دیاریکراودا نەبێت، وەك زیافەتی تەوتەمی.

بێگومان پەرستنی (دڵێ هول)، لە میسری فیرعەون و گای باڵدار لەکن ئاسوورییەکان و تاووس لەلای یەزیدییەکان لە پاشماوەی ئەم تەسوراتەوە ماونەتەوە، چونکە سەرچاوەکانی خۆراك، وەك ڕووەك و گیاندار دەشێت لەناو بچن و نەمێنن ـ ئەگەر سنووری بۆ پاراستنیان دانەنرێ، لەبەر ئەمە حەرام کردن [ تابو Taboo ]یان هێناوەتە کایەوەو کردوویانە بە (پیرۆز) و (پەرستن)، هەتا کەس تووخنیان نەکەوێ و دەستیان بۆ نەبات . .

ئەحمەد فەرەج دەبێژێ: «ئەو خێڵە سەرەتاییانە، ویستوویانە ژیانی هەندێ گیانداری دیاریکراو بپارێزن، هەتا لەناو نەچن و زاوزێ بکەن . . هەر خێڵە گیانداریکی بۆ خۆی هەڵبژاردووەو کردوویە بە خوشەویستی خۆی و ڕێ نادا بە هیچ کەسێ بیکوژێ، یان گۆشتەکەی بخوات، مەگەر لە ئاهەنگێکی تایبەتیدا، کە تاکەتاکەی خێڵەکە هاوبەشی تێدا بکەن، هەتا گیانی پیرۆزی ئالوێتە بە گیانی کۆمەڵ بێت . . لەبەر ئەوە ئەو ئاهەنگانە بوونە جەژنێکی تایبەتی، تەواوی خێڵەکە ئەو گیاندارەیان خۆش دەویست و بەرگیان لە پێستەکەی دروست دەکرد و، لەبەریان دەکرد»[٢١] . .

وە ئەوەی شایانی سەرنجدانە، یەزیدییەکان لە جەژنی گەورەدا (جەژنی بەکۆمەڵ) لە ڕۆژی چوارەمدا ئاهەنگێکی بەکۆمەڵیان دەگێڕا، پێیدەگوترا (سماط چلمیرە)[٢٢] هەموویان لەو خواردنەیان دەخوارد) کە بۆ گشتیان ئامادەکرابوو.

بیر و باوەڕی (تابو) بەر لە پەرستنی تەوتەمی پەیدابووەو لەناو شێوەکانی دی پەرستندا بڵاوبۆتەوە[٢٣]. تابو هەر بەردەوامبوو، [خۆی لە] زۆرترین هەرێمەکانی گۆی زەویدا، داکوتا . .

## د ـ گیانەوەری (ڕوحانی AMIMEISM) :

شێوەی چوارەمی بیر و باوەڕی سەرەتایی، ئەو بیر و ڕایەیە، کە باوەڕی بە ژیانەوەری ماددەی هەیەو باوەڕی بەوەش هەیە، کە هەرچی لەم بوونەوەرەدا (کون)دا هەیە، بەڵکو لە بوونەوەرە خۆشیدا، گیان هەیە و تێیدا

بەردەوامە. چونکە لەو باوەڕدایە، کە گیان ڕێرەوێکی زیندەگی ڕێکوپێکە بۆ بوونەوەریش، لەبەر ئەوە هەندێ پێی دەڵێن: «باوەڕی زیندەگی»[14] سەبارەت بەوەی کە مرۆڤە سەرەتاییەکان خۆیان خستبووە ژێر چاودێری خۆیانەوە، پارمەتی ئەوەی دان، کەوان تەسوور بکەن.. گیان دەجوڵێ و دەنگیشی هەیە.. گیان لە جەستە (لەش): دەچێتە دەرەوەو لە کاتی نووستندا، دەگەڕێتەوە بۆی. هەروەها گیان لە پەڕدو درەختەکان، لەدوا مردنو وشکبوون، جارێکی دی ژیان بۆ دەگەڕێتەوە.. ئەمە یارمەتی ئەوەی داون لە تەسەوری گیانەوەری (الروحی) خۆیان بکەن لە هەموو شتێکدا..

## ئاسەواری بیروباوەڕە سەرەتاییەکان لەلای یەزیدییەکان؛

بێگومان بوونەی زیهنی دێرینی کوردەکان هیچ لە بوونەی زیهنی دراوسێیەکانو گەلانی هاوسێیان لە هەرێمەکەدا، دواکەوتووتر نەبووە، لە هێنانەدیو داهێنانی تەسەوراتی ئەفسانەییدا. بۆ وردبوونەوە لەو سروشتە گۆڕانگۆڕە، کە لە وەرزەکانی ساڵدا بە چاویانەوە ڕووی دەدا. وە هەروەها ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەی کە لە نێوانیاندا هەبوو، تایبەت بە خۆیان بوو، مەگەر بە ڕێژەیێکی کەم جیاوازی هەبووبێت لە شێوەی ژیانی هەموو کۆمەڵەیەدا، لە ڕووی بەرهەم هێنانو جوداوازی لە ئاستەوای گۆڕانی بەرهەمی هەر یەکێکیاندا. ئەمەش لەبەر ئەوە بووە چونکە بەرهەمهێنانو ئاستەوای گەشەکردن، پەیوەندی بە ئاستەوای وشیاریو هەستکردنەوە هەبووە. وە ئەگەر هەتاوەکو ئێستا نەتوانرابێت دەقێکی نووسراو (تۆمارکراو) بە زمانی کوردی

چنگ بکەوێو رابوردووە کوردی یەکەی.

لە دێریندا، پەیدوونبکرێتەوە؛ بە ناچاری ئەمڕۆ پشت بەو سەرچاوانە دەبەستین، کە بە زمانی کوردی نیینو شتیان لێ وەردەگرین دەربارەی کوردو بە پێوانەی مەتیق هەندێ سەرنەنجامیانلێ هەڵدەهێنجین، لە ئەنجامی نۆرینە لەو گۆڕانکاری - یەی کە بەسەر مرۆڤدا هاتووە لە ژیانو گوزەرانیدا، هەروەها مێژووی گەلانی دراوسێ.. لە ئاخریدا دەگەینە ئەوە، کە کوردە دێرینە سەرەتاییەکان، ئەوانیش دیسان تەسەوراتو خەیاڵاتو پەرستگەو باوەڕگەی سەرەتایی تایبەتی خۆیان هەبووە، هەروەک دەبینین هەندێ شوێنەواریان هەتا ئەمڕۆش وەک خۆیان ماونو پارێزراون، وەک پاشماوەکانی باوەڕگەکانی ڕابوردوو، کە بەر لەوەی مادییەت ڕوو بدات، ئەمان هەبوونو ئۆریخۆشکەر بوون بۆ هەنگاونان لە کۆمەڵگەی هاوبەشییەوە (مشاعی) بۆ کۆمەڵگەی چینایەتی. ئەوجا بە پێی ئەمە باوەڕگە سەرەتاییە کۆنەکان دەکەونە بەر لێشاوی گۆڕانو هەڵگەڕو داگەڕ، جگە لەوەی چنگیش براوە بۆ وەرگرتنو چنینەوەی شتەک لە کۆمەڵگاکانی دراوسێ، کە لەوان گۆڕاوتر و پێشکەوتووتر بوون.. بەڵام

ئەو پاشماوانەی کە لە باوەڕگەی یەزیدییەکانەوە سەری هەڵداوە، بە وێنەیێکی گشتی ماون پارێزگاری جەوهەری خۆیان کردووە، وەک:

١- خوای شەڕ (شەیتان)، چوّتە شێوەی (تاووس)ەوە، کە باڵندەیەکەو پەڕەکانی لە پێی مراوی دەچێت (مەلەک تاووس)= پەرستنی تەوتەمی[15].

٢- باوەڕهێنان، کە گیان دەروون دەچێتە جەماوەرەوەو لە گیانەوەردا دەژیتەوەو لە ڕووەکدا سەرهەڵدەداتەوەو لە مرۆڤدا - لەدوا دەرباز بوون لە جەستەی مرۆڤدا، لەدوای مردن، دەگەڕێتەوە[16]= پەرستنی گیان (گیانەوەری).

٣- حەرامکردنی خواردنی ڕووەک (کاهو، کەلەرم، قەرنابیت، هەندێ سەوزەو کولەکە)[17] و گۆشتی گیانداران (بەرازو، ماسی بە خۆی گشت جۆرەکانییەوە، کەرامەزو، کەڵەشێر) لە شێخو دەستو پیوەندەکانی حەرامە، بۆ ڕێزگرتن لە شێخو دەستو پیوەندەکانی حەرامە، بۆ ڕێزگرتن لە خواوەندەکەیان (مەلەک تاووس)[18]= پەرستنی تەوتەمی.

٤- بە پیرۆززانینی هەندێ درەختی دیاریکراو (پەرستنی گیان)[19].

٥- ئاهەنگی بە کۆمەڵ (سماط چلمیرە)، لە ڕۆژی چوارەمدا لە جەژنکردندا بە کۆمەڵ (ئاهەنگی تەوتەمی)[20] دەگێڕدرێت = پەرستنی تەوتەمی.

گەوهەری بیروباوەڕی یەزیدییە سەرەتاییەکان خۆجێیی بەو پێیەی بوونی ساڵەهای ساڵ خراوەتە چوارچێوەی کارتێکردنی دەرەکی دراوسێ: ئێرانی و... هتد.

مامۆستا عبدالرزاق الحسنی دەربارەی ئەو شتەکانەی کە لە یەزیدییەکان قەدەغەکراون، دەڵێ: کاهوو، کەلەرمو قەرنابیتو هەندێ سەوزە کە بە پێی مرۆڤ پەیینەکرێن، خواردنیان بۆ یەزیدییەکان حەرامە..)، وەک دەبینین حەرامکردنی هەندێ خۆراک بەندە بە پەیینکردنەوە.. ئەمە پەلێکی دواکەوتووەو هیچ مانێ بە یەزیدییەکان نابەخشێ، چونکە فاسۆلیاو لۆبیا، کە د. سامی سعید ناویان دەهێنێ بە پێی مرۆڤ پەیین ناکرێن، هەروەها کلەو (کولەکە).. ئەوەی ڕاستی بێت ئەم شتەکانەی کە حەرامن، پاشماوەی بیروباوەڕە کۆنەکانیو ماونەتەوە - لە پەرستنی تەوتەمییەوە.

## هەندێ بیروڕاو فەرەزیات، دەربارەی بنچوبناوانی ناونانی مەلەک تاووس:

لە مێن زەکی وا بۆی دەچێت، کە وشەی (تاووس) لە بنەڕەتدا، یۆنانییەو لە وشەی (تیۆس)ەوە وەرگیراوە، کە بە واتای (خوا) دێت. مەسیحییەکانیش لە یۆنانییەوە وەریانگرتووەو لە کتێبە ئایینییەکانیانو سڵاوەتەکانیاندا بە واتای (خواوەند) بەکاریان هێناوە، لەپاشا بەرەبەرە گۆڕدراوە هەتا بوّتە هاوتا لەتەک پەیڤی (خوا)دا، ئەوجا یەزیدییەکان

لەوانیانەوە وەرگرتووەو بەسەر بتە ناوبراوەکەی خۆیاندا بڕیوە[31]

ئەم بیروڕایەی ئەمین زەکی ئەو وتەیەی خۆی پشتڕاست دەکاتەوە، کە دەڵێ: «یەزیدییەکان کڕنوش دەبەنە بەر بتەکەیان، کە لە شێوەی باڵندەیەکدایە، پێی دەگوترێت (مەلەک تاووس)وە لەو باوەڕەدان، کە ئەم خودایەی ئەوان بەر لە هەموو بوونەوەری (کائن)ێ هەبووەو لە هەموو شوێنێ ئامادەیە. هەر دوابەدوای ئەم بیروڕایەی دەڵێ: باوەڕگەکانی یەزیدییەکان لە ئێرانەوە هاتووەو لە (مانەوی)و زەردەشتییەوە وەرگیراون.. هەروەها لەسەری دەڕواتو دەنووسێ: «بنچینەی ئایینی یەزیدییەکان دەگەڕێتەوە بۆ مەزهەبی (مانەوی)، وە بەپێی حیکایەتێکی دی دەگەڕێتەوە بۆ ئایینی زەردەشتی، چونکە یەزیدییەکان خۆشیان دان بەوەدا دەنێن، کە دوو خواوەند هەیە پەرستنی (خودا)و، (شەیتان) بەپێویست دەزانن، وەک زەردەشتییەکان، کە پەرستنو دروستو پێویست دەزانن. هەروەها باوەڕیان بە بوونی (خوای شەڕ) هەیە، کە ڕەحمەتو بەزەییو بەرزی نایەتە کۆتایی، دیسان باوەڕیشیان بە (شەیتان) هەیەو گوە بێگومانن، کە شەیتان بە تەنیا سەرچاوەی شەڕو بەڵایە، لەبەر ئەوە پەرستنی پێویستە بۆ خۆپاراستن لە شەڕو خراپەی، دەترسن نەکو بکەونە بەر شاڵاوی زوڵمو زۆرداری..)[32].

ماموستا عبدالرزاق الحسنی باسی بە بنچینەو بناوانی ناوی (مەلەک تاووس) نەداوە، بەڵام لەو چیرۆکو حیکایەتانەی کە لە (مەلەک تاووس) دەدوێن، دیگێڕێتەوەو دەڵێ: «یەزیدییەکان وادەبینن ئەمری بوونەوەر (کون) لە دوو هێز پێکهاتووە ـ هێزی خێرو هێزی شەڕ.. هێزی خێر، کە (خوای مەزن)ە، بەسەر هێزی شەڕدا، کە (شەیتان)ە، زاڵبووەو لە بەهەشت (مەلەکوت) دەری هاویشتووە. هەروەکو زەردەشتییەکان باوەڕیان بەوە هەیە، کە دوو خواوەند هەیە: خواوەندی خێر، کە (هورمزد)ە، خواوەندی شەڕ، کە (ئەهریمەن)ە.. لێرەدا، وە بەپێی تێبینی یەزیدییەکان، شەیتان لە شێوەی فریشتەی دەرکراودا.. لە دوا دەرکردنەکەی گەڕێنراوە ئەوەو کەوتۆتەوەکارو، مایەی هەڵگرسانی هەموو شەڕو ئاژاوەو خراپەیەکە.. لەبەر ئەوە خۆیان لە ناوهێنانی دوور دەپەرێز دەگرن، حیکایەتی (ئادەمو مارو تاووس) کە لە تەوراتدا هاتووە بەسەری داهاتنیق دەکەنو ڕادەچێنە دڵیانەوە، ئەو (تاووس)ەیە، کە لە بەهەشت دەرکراوە[33]..

لەپاشا ماموستا الحسنی لە جەژنی سەری ساڵی یەزیدییەکان دەدوێو دەڵێ: [یەزیدییەکان وای بۆ دەچن (مەلەک تاووس) لەم ڕۆژەدا، واتە جەژنی سەری ساڵدا هاتۆتە خوارێ بۆ سەر زەوی بۆ ئەوەی موسا(ع) خۆیو هاوکارەکانی لە فیرعەونی فیرعەونییەکان ڕزگار بکات][34]. هەروەها دەیڵێ: فریشتەی لەبەرچاوکەوتوو، لەپێش ئەوەی لە بەهەشت دەربکرێ، پێی گوتراوە (تاوسی مەلائیکە) لەبەر جوانی شێوەکەیو قەشەنگی وێنەکەی.

لە لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنی داتراوەکانی ماموستا ئەمین زەکیدا، کە تایبەتن بە کاروباری کوردەوارییەوە، هەروەها ماموستا عبدالرزاق الحسنی، کە پسپۆڕە لە مێژووی کۆنو بایەخدەر بە کاروباری مێژووی گەلی، هەروەها د. سامی سعید الاحمد، دەگەینە ئەو ئەنجامە، کە هەموویان لەو باوەڕەدان، کە ئایینی ئێرانی کاری کردۆتە سەر بیرو باوەڕی یەزیدییەکان. لەپاڵ ئەمەشدا، ئایینی جولەکەکانو مەسیحییەکانو ئیسلامەکانیش تا ڕادەیەک کاریان کردۆتە سەر بیرو باوەڕی یەزیدییەکان، سەبارەت بە شەیتانو تاووسو، چیرۆکی نەمرود.. بەڵام ئەوەشیان دووپاتکردۆتەوە، کە زەردەشتیو مانەویش بەشی خۆیان کاری گەورە بوون. سەبارەت بەوە کە یەزیدییەکان خواوەندی خێرو شەڕیان لەلا پیرۆز بووە، لە هەمان کاتدا، بەتایبەتیو زیاتر بایەخیان داوە بە خوای شەڕ، کە شەیتان لە شێوەی (مەلەک تاووس)دا تەنەری بووە (واتە: نوێنەری خوای شەڕ).. هەروەها بەجیاواز، یان بە وێنەیەکی ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ پەنجەیان بۆ ئەمسەران ئایینە کۆنەکانی عیراق درێژکردووە.

دەموزی، یان (تاووسی) دوو ناونانن بۆ یەک خواوەند ـ وەک لە ئیمە ڕوونە، وەلێ هەڵگەڕو داگەڕو ڕۆژگار بوونە هۆی ئەوە بە ڕواڵەت وا بزانرێ، کە دوو شتی جیاوازن، وەک لەمەوپاش گۆڕان لە کارو کردنیو مەرکەزی هەر یەکێکیاندا ڕوویدا، بەبۆنەی دووری زەمانو شوێن.. هەرچەند ئەمەش شتێ لەو ڕاستییە ناگۆڕێ، کە هەر دووکیان ـ دەموزیو تاووسی، دوو ناون بۆ یەک خواوەندو، هەر دووکیان لە خۆشیو شادی (لە بەهەشت، یان گێتی زیندووکردنەوە) دوورخراونەتەوەو کەوتوونەتە بەر باری ئەشکەنجەو ناخۆشی. وە ئەو ڕووداوانەی کە بەسەر گۆڕانی ناونانو کاروبارو مەرکەزی هەر دووکیاندا هاتووە، لەدوای جیابوونەوەی وەچەکانو دوورکەوتنەوەیان لەیەکتری تا ڕادەیەک کاری کردۆتە سەر ئەم گۆڕانکارییە.. کە کاتێ سۆمەرییەکان لە باکووری عیراقەوە گەڵیان گواستەوە بۆ باشووری عیراق، لە شوێنە نوێیەکەشاندا دەستبەرداری ناونانەکە (ناونانی دەموزی) نەبوونو پاراستیان.. بەڵام (دەموزی) لە سەردەمی بابلییەکاندا گۆڕانێکی بەسەردا هاتوو بوو بە (تاووز) لەکن سوبیو حورانییەکان لە باکووری سوریا.. وەلێ ئەو کوردە کۆنانەی کە لە وڵاتەکەی خۆیان نەجوولانو هێشتیانەوە. هەتاوەکو ناونانەکە تووشی گەردەلوولی ڕۆژگار بوو و گۆڕدرا بە (تاوزی)، هەر لەمێژەوە (مەلەک تاووس) داهات. دەشتوانین بڵێین بەپێچەوانەوە ڕاستترە: بنەڕەتی

ناونانەکە لەپێشدا (تاووس ـ تاووز) بووەو بە تێپەڕبوونی ساڵو سەردەم گۆڕدراوە بە (دموزی). ئەمە لەتەك باوەڕگەی یەزیدییە کۆنەکاندا دەگونجێت . .

وەئەبێت هێمای خواوەندەکان: (دموزی) سۆمەریو (تەموز)ی بابلیو (تاووس)ی یەزیدیو (تاوز)ی سورییە حەرانییەکان تەنیا لە ناوەڕۆکدا لەیەکەوە نزیکن، بەڵکو هەتا ڕادەیێکی فرەش لە ڕووی بێژەیییەوە لەیەك دەچن. لەبەر ئەوە وا فەرز دەکەین، کە هەر یەکێ لە دموزیو تاووسو تاوز لەیەك ڕەگەوە هاتوونەتە خوارێو هیچ گیروگرفتێ لەوەدا نییە، ئەگەر جیاوازی کەوتبێتە نێوان پیتەکانەوە سەبارەت بەوە کە گ ۆڕانکارییان بەسەردا هاتبێو جیاوازی لە گۆکردنی هەندێ پیتدا ڕووی دابێ، لەنێوان هەندێ کۆمەڵی دوور لەیەك، بەپێی سەردەمو شوێن، خواوەندی (دموز) دەتوانرێ بە زمانی کوردی بێژرێ (توزشی، تاوسی، توزی، تاوزی) چونکە پیتی دال دەتوانرێ بگۆڕدرێتەوە بە پیتی (ط)و (ت)، هەروەك لە ناونانی شاری (داقوق)دا، زۆربەی خەڵکەکەی ئەوێ دەیێژن (طاووغ)، یان (تاووغ)، هەروەها لە گۆکردنی شارۆچکەی دوزخورماتوو، دەتوانین بڵێین (طوزخورماتوو) و(توزخورماتو)، بەڵام پیتی (ز) دەگۆڕدرێت بە (س)، وەبەپێچەوانەشەوە دەتوانرێ بە شاری (سەرد) بێژرێت (زەرد)، وەك هەندێ دەڵێن: فلان زەعرتییە . . هەروەها پیتی (م) دەگۆڕدرێت بە (و) لە زمانی کوردیدا، وەك:

ـ وشەی (نام) دەبێژرێت (ناو)

ـ وشەی (نیم) بە (نیو)

ـ وشەی (چام) بە (چاو)

لەم هەڵسەنگاندنو بەراوردکارییەوە، دەتوانین بڵێین: ناوی (دموزی) دەتوانرێ بە (تاووسی) و(تاووزی) گۆبکرێ . . بە دووری مەزانن، کە وشەی (تاوز= خواوەندی تاوز) خواوەندی حەرانییەکان لەوەوە کەوتبێتەوە . . گەرچی هاتە خوارەوەی بێژەی (تاوز) لە (تەموز)ەوە هاتنی زۆرتر ڕێی تێدەچێ، چونکە پیتی ئەلف وەرگیراوی پیتی (م) لە وشەی (تەموز)دا . وە دەشێت ناونانی (تاوز) لە (تاوس)ەوە هاتبێتە خوارێ، سەبارەت بەوەی کە هاوسێنو دەتوانرێ ڕاستەوخۆ لێوەی وەربگیرێت، چونکە ئەو هەرێمانەی کە سورییە حەرانییەکان تێیدا نیشتەجێ بوون ـ وەکو لە کتێبی «حرانکوتا»دا هاتووە، لەنێوان ڕانو میدیادا بووەو هەر هەمان هەرێمن، کە یەزیدییەکان لە دێرترین زەمانەوە تێیدا نیشتەجێ بوون، بەڵام ناونانی (تاووس) لەتەك ناونانی (دموزیو دەموزی) پەلدەگرنەوە، کە بنچینەی ناونانی (تموز)ە . .

دەبێت ئەوەش بزانین، کە حەرانییەکان ناوی (تموز= تەموز) بە مانگی چوارەم دەڵێن لە ساڵنامەکەیاندا . . هەروەها ابن الندیم لە «الفهرست»دا دەیێژێ: ئەوران بە ڕاشکاوی پەنجە بۆ خواوەندی (تاوز) بە ناوی (تموز)ەوە ڕادەکێشێ . . بەمە بنچینەوان ناونانی (تاوز) دەخرێتە نێوان (دموزیو) تاووس)ەوە . بەڵام کێشەی دانانی سنووری بۆ کاملیان ڕاستەو، کاملیان لەپێش ئەویتردا هاتوتە گۆڕێ، لە ناونانی (دموزیو تاووس) ئاڵۆزەو پێویستی بە لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنو دەراسەیێکی وردو بەرفراوان هەیە . . ڕەنگە ئەو جیاوازییەی نێوان دموزیو تاووس بۆ ئەوەمان ڕابکێشێ، وا هەستبکەین، کە دوو خواوەندی جیاواز لەیەکتر هەیە . بەڵام ئێمە وای بۆ دەچین هەردوو ناونانەکە هی یەك زاتن، چونکە دموزی لە باکووری عیراق بەر لەوەی بگوێزرێتەوە بۆ نێو سۆمەرییەکان لە باشووردا پەرستراوە . . لە هەمان هەرێمدا پەرستراوە، کە «مەلەك تاووس»ی تێدا پەرستراوە . .

لێرەدا کێشەی چواندنی مەلەكتاووس بەو باڵندە ناسراوەی کە پێیدەبێژرێ (تاووس) دەمێنێتەوەو چارەرێی چارەسەرەو پرسیارێکیش سەر هەڵدەدات ئایا هەڵبژاردنەکە لەپێناوی گونجاندنی شتێ بە شتێکە، لەدوا ئەوەی کە (دموزی) گۆڕدراوە بە (تاووس)؟ یان ناونانی «تاووس»، لە پاشماوەی پەرستە سەرەتاییە کۆنەکانەوە سەری هەڵداوە؟ باڵندەی تاووس لە زەمانی هەرە کۆندا تەوتەمی بووە بۆ کۆمەڵەیەك، کە لە باکووری عیراقدا لە ڕۆژانی پەرستنی سەرەتاییدا ژیاون ئەو کۆمەڵەیە تەوتەمەکەی خۆی (باڵندەی تاووس) پاراستووەو دەستبەرداری نەبووەو بە تێپەڕبوونی زەمان، گرنگیو بایەخی پێدراوەو هەتا لەلایان پیرۆز بووەو کەوتوونە پەرستنیو بەدڵ خۆشیان ویستووەو بەچەندان ئەفسانەیان دەربارەی تواناو هەبوونی وزە تێیدا، کە دەتوانێ ڕەنجو ئازار نەشکەنجەو ئازار بە خەڵکی بگەیەنێ داناوە، لەبەر ئەوە خوای خێرلێی بە لیتاکەوتو لە بەهەشت دەری کرد . .

لەبارێلندا، کە دەبینین «تەوتەم تاووس» گۆڕدرا، یان بوو بە خواوەندێك شایانی ڕێزو، پەرستنو بایەخ پێدانێ بێتو لەنێوانی حەوت خوداوەندا خۆ بە دەربخات، ناونانی ئەو خواوەندە بە «مەلەك تاووس» لەجێی خۆی دایە . .

## سەرچاوەکانو دەرکەنارەکان:

١ـ زانای بەناوبانگ محمد امین زکی کورتەی مێژووی کوردو کوردستان، کە مامۆستا محمد علي عون لە کوردییەوە کردوویە بە عەرەبی ـ بەغداد، ١٩٦١ ـ ل ٢٩٧ هەروەها بڕوانە:

ـ د. سامي سعيد الاحمد، یەزیدییەکان، دوو بەرگ ـ بەغداد ١٩٧١ز . ـ صديق الدملوجي، یەزیدییەکان ـ موصل، ١٩٤٦ .

ـ مامۆستا عبدالرزاق الحسني، یەزیدییەکان ـ بیروت ١٩٨٠ .

- عباس العزاوي، مێژووی یەزیدییەکان - بەغداد ١٩٣٥ .

- د. شاکر خصباك، عیراقی باکوور - بەغداد ١٩٧٣ ، ل ١٨١-١٨٧ .

٢- خیرالدین زرگەلی - الاعلام - بیروت ١٩٦٩ ، ١٥ / ١١ .

٣- محمد امین زکی - کورتەی کوردو کوردستان ل ٢٩٧ ودەرکەناری پەنووس (١) .

٤- هەمان سەرچاوە، ل٢٩٧ ، دەرکەناری پەنووس (٢) ، کە بەوێنەیکی گشتی لە بنچینیاوان بوونەوەرەکان (الکائنات)و بنچینیاوان یەزیدییەکان دەدوێ .

٥- جەژنی سەری ساڵ دەکەوێتە یەکەم رۆژی چوارشەمە لە مانگی نیساندا، کە یەکەم مانگە لە ساڵنامەی یەزیدییەکان .

٦- یەزیدییەکان، ل ٤٢

٧- ف. ئەنگلز، لودفیغ فیورباخ و کۆتایی فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی بە (رووسی)، موسکۆ، ١٩٥٢ ل ٤٨ ، هەروەها مارکس ئەنگلز (بە زمانی عەرەبی) موسکۆ ١٩٧٠ ، ٤ / ٦٢

٨ - دینکی، فەرهەنگی زانستی کۆمەڵایەتی، گۆڕینی د. احسان محمد الحسن - بەغداد ١٩٨٠ دەربارەی هاوسەریی گۆشتی (الزواج اللحمی): ل ١٢٣ -٤ ، هاوسەریی دەرەکی ل ١٣٣-٤ [مەبەست لە هاوسەریی گۆشتی ئەوەیە نابێت ژن لە ئەوەو خوێشی نزیکو خێڵی بهێنری، کە لەیەك گۆشت بن، واتە خوێن و گۆشتیان تێکەڵ بە یەك بووبێ (وەرگێر) .

٩- مێژووی گشتی عالەم، دانانی لیژنەیەك لە زانایانی سۆڤیەت بە زمانی رووسی، موسکۆ ١٩٥٥ ، ١ / ٧٣ . هەروەها بنۆڕە: وتارەکەی ئێمە دەربارەی فەلسەفەی وەضعی - گۆڤاری (آفاق عربیة) ساڵی پێنجەم ١٩٨٠ ، ٥ / ١٥٧ .

١٠- د. نەعیم فرح، مێژووی ژیاری عالەمی کۆنو پێش مێژوو، دیمشق ١٩٧٥ ، ل ٢٧ (مەبەست لە ژیاری (حضاریە) . هەروەها بنۆڕە: سغموند (موساو یەکتی) گۆڕینی جورج طرابیشی، چاپی بیروت ١٩٧٧ ، ل ١٨٠-١ ، هەروەها بنۆڕە: وتارەکەی ئێمە دەربارەی فەلسەفەی وەضعی، کە لە گۆڤاری [آفاق عربیة)ی ٥ / ١٥٦ و دەرکەناری پەنووس (٣٤)دا بڵاوکراوەتەوە .

١١- مێژووی ژیاری عالەمی کۆن، ل ٢٧ .

١٢- دەربارەی (سماط چلمیرە)و (جەژن بە کۆمەڵ) ، یان جەژنکردن بە کۆمەڵ، بنۆڕە: د. سامی سعید الاحمد - الیزیدیە احوالهم ومعتقداتهم، ل ٢ / ١٧٩-١٨٤ . هەروەها بنۆکرە: مامۆستا عبدالرزاق الحسنی، کە لە کتێبەکەیدا (الیزیدیون)، ل١١٧ ، ١١٩ ، ١٢١ ، ١٢٢ دەیێژێ: جەژنی بە کۆمەڵ (رەنگە گرنگترین جەژنی یەزیدی بێت، ل١١٧) .

١٣- بنۆڕە: ئەنگلز، دانراوەکانی مارکس، ٢٤ / ٥٩٨ ، هەروەها بڕوانە وتارەکەی ئێمە دەربارەی گۆڕانکاریی ئابووری، گۆڤاری (کلیة الاداب) ، ١٧ / ٢٢٥-٢٢٧ .

١٤- یۆزپادەمزان، بنۆڕە: فرۆید، (موساو یەکتی)، ل١٥٧-٨ .

١٥- بنۆڕە: د. سامی سعید الاحمد، ٢ / ٥٦-٦٠ هەروەها مامۆستا الحسنی - یەزیدیەکان، ل ٤٢-٤٦ .

١٦- الحسنی - یەزیدییەکان، ل ٨٧ -٨ ، هەروەها، د. سامی سعید الاحمد، یەزیدییەکان، ٢ / ١٠٧-١١٤ .

١٧-١٨- الحسنی یەزیدییەکان ل ١٠٠ ، هەروەها د. الاحمد، یەزیدییەکان - هەندێ گیاندارو رووەکی تریش دەهاوێتە سەر لەو لیستەیە، کە شەکی پێ لە یەزیدییەکان قەدەغەکراوە، وەك (کۆتر و، کەرویشك و، فاسۆلیاو، لۆبیا)، ٢ / ١١٩ .

١٩- الحسنی - یەزیدییەکان، ل ١٠٣ .

٢٠- بنۆڕە: ئەوەی فروید دەربارەی (زیالبەتی (موساو یەکتی) نووسیویەتی، ل ١١٤ - ٥ فروید کتێبێکی لەسەر (ئەوتەم و تابو) داناوەو لە ساڵی ١٩١٢ دا بە چاپی گەیاندووە، بەڵام من هێشتا نەمدیوە .

٢١- کورتەی کوردو کوردستان، ل ٢٩٦ ، دەرکەناری پەنووس ژمارە (٣١) .

٢٢- هەمان سەرچاوە، ل ٢٩٤ .

٢٣- یەزیدییەکان، ل ٤٢ ، ناوی هەردوو خوای زەردەشتییەکان: [آهورامزدا)و، (آهورامین) بە شێوازی لەلای مامۆستا محمد أمین زکی و مامۆستا عبدالرزاق الحسنی ناویان هێنراوە. (آهورا)ش واتای خواوەند دەگەیەنێ. .

٢٤- هەمان سەرچاوە، ل ٤٤ لاپەڕەکەمان بە تەواوی رووونووس کردووە.

---

ملخص البحث

## هل كان إله اليزيدية طاؤوس ملك طوطما؟

يواجه الباحث بشؤون الطائفة اليزيديه، وغالبيتهم اكراد يقطنون شمال العراق الجبلي، وفي خارجه، مسألة متشابكة معقدة عن الاصل الذي انحدرت منه تسمية إله الشر [الشيطان] بـ«طاؤوس ملك»، لتضارب الافتراضات وتشعبها وابتعادها عن الواقع وافتقارها للبت برأي مقنع لاطع. فلقد وجدنا، ونحن نعد بحوثنا، لا تزال مخطوطة، وهي :-

١- دراسات عن بعض اصول الاكراد

٢-الجذور الاسطورية لملحمة النوروز الشعبية
٣-المفصل في نشأة النوروز اللحنية الابداعية.

بأن العديد من الافتراضات متالفة وبعيدة عن الواقع، لبعضها، للعلامة محمد امين زكي ود. سامي سعيد الاحد والاستاذ عبدالرزاق الحسني [1]، وقد ارجعت العقيدة اليزيدية الى اصول ايرانية، الى تأثير العقيدة الثنوية الزرادشتية-المانوية، عن اله الخير والنور «هورامزدا»، واله الشر والظلمه «آهورامين»، ونسبت تسمية اليزيدية الى الديانة المجوسية، السابقة للزرادشتيه، على اعتبار انحدار اللفظة [اليزيدية] اما عن اسم مدينة «يزد» الايرانية والتي كانت من مدن المجوس المهمة، واما عن الههم «يزدان»، بينما يروون عن اليزيديين ادعائهم، حسب ما ترويه كتبهم المقدسة، الجلوة، ومصحفي رش [الكتاب الاسود]، بازلية وقدم معتقداتهم وان الههم «طاووس ملك» الشيطان، الذي وصف بطاؤوس الملائكة لجماله، قبل العصاله وطرده من الجنة، بأن ليس له بداية ولا نهاية وهو ملاك ساقط قديم اعيد بعد سقوطه، ثم يذكرون، امين زكي ود. سامي سعيد، غير ذلك بان تسمية الطاؤوس مقتبسة عن اليونانيين، عبر المسيحيين، عن لفظة ثيئوس Theos، التي تعني عند الاغريق (الله)، بينما يورد د. سامي، بتلخيص مكثف، العديد من افتراضات الباحثين ومناقشاتهم عن احتمال ارجاع تسمية الطاؤوس ملك الى الاله تموز حيث كان يعبد، بالاضافة الى جنوب العراق، في شمال العراق وسوريا ايضا، ولا عبرة باختلاف بعض الاحرف بين طاؤوس وتموز لحرف الميم يلفظ باللغة الكردية احيانا واو، كما نام= اسم ناو، نيم=نصف نيو، وچلم= عين ـ چاو، وغيرها، كما يمكن ارجاع عبادة الطاؤوس كطائر الى ما كان شائعا من عبادة الحيوانات المقدسة في آشور والطيور المقدسة المستخدمة للسحر في العصور البابلية. ومع تقديرنا للجهود العلمية الرصينة المبذولة لدى المذكورين اعلاه، فان افتراضاتهم في مجملها لم تقدم تفاصيل دقيقه عن الاصل ولم تبت برأي قاطع عنه، وتحرم، في الوقت نفسه، الاكراد الاقدمين من امتلاك القدرة على ابداع تصوراتهم الخاصة عما كان ينعكس امامهم من تجليات محيطهم ومجتمعهم البسيط بينما نرى الدراسات الاثارية والانثروبولوجية والانثولوجية [العراقة] بان بنية قدماء الاكراد الذهنية لم تتخلف عن مجاراة نظائرها في المنطقة في اختلاق تصورات خاصة بها انطازية [Fantastical] انعكاسية لتجليات الطبيعة المتغيرة امامهم، فصليا، وللعلاقات الاجتماعية البسيطة القائمة بينهم، الا نسبيا، بمقدار الاختلاف في نمط الانتاج السائد لديها وللتباين في مستوى تطوره لدى كل منها وذلك لعلاقة الانتاج ومستوى تطوره الجدلية، بمستوى الوعي والادراك. ولما كان شمال العراق الجبلي ينفرد قديما بامتلاك الشروط الظرفية الملائمة انئذ للحياة، بتوفير القوت من المواد الغذائية. النباتية والحيوانية وملاجيء من مغار وكهوف، فكان من الضروري البحث في ماضي المنطقة السحيق، الى نشأة المعتقدات البدائية لذلك انطلقنا لدراسة ذلك الماضي وما فيه من بدايات اولية لنشوء المعتقدات بروح علمية وبتجرد موضوعي يستلزم التحرر من سلطان الهوى - والتعصب العرافي والعقائدي، لدراسة الاشكال الاربعة البدائية: السحرية Magical والفيتشية Fetishisw والطوطمية Totemisw والارواحية مما هيأت لنا امكانية تقديم افتراض نعتقد برجحانه من ان العقيدة اليزيدية تمتلك رواسب من تلك الاشكال الاربعة بعد تطورها وتداخلها وان الاله طاؤوس ملك كان طوطما معتمدين على ان السنجق الذي يمثل الاله طاؤوس هو على هيئة طائر [اقرب الشبه بالبطة من دون أرجل] وعلى تحريم نباتات وحيوانات وتقديس اشجار معينة وله قدرة خارقة في الشفاء والوليمة الجماعية [سماط چلميرة (الاربعون) في اليوم الرابع من عيد الجماعية اليزيدي] وهي تشابه الوليمة الطوطمية واعتبار الطاؤوس الها حاميا ومنقذا ومخلصا وله القدرة الخارقة على الحاق الضرر بالبشر، مع الايمان، بالحلول والتناسخ مما يدلل على عميق صلة المعتقد اليزيدي بالمعتقدات البدائيه المؤروثه من الاشكال الاربعة وخاصة من الطوطمية والارواحية. واذا كان من الصعب، لحد الان، الحصول على نصوص كردية مدونة توثق ماضي الاكراد السحيق فان ذلك لا يقف حائلا ولا يمنع من مواصلة البحث لاستنتاج قياسي منطقي، ولما كان انسان كهوف شانيدر وزرزي وهزارمرد وجومو وكريم شهر اللذين تمت دراسة عظام هياكلهم وبقاياهم من قبل گارود وسوليكي وسهايزر واويتهايم وموررتكات وستون لويد وغيرهم، ينتمون الى انسان نياندرتال الذي ظهرت لديه بداية المعتقدات الهمجية ومن ثم الانتهاء الى الانسان العاقل tfono sagiens انسان الكرامانيون الذي تطورت لديه المعتقدات بعد ان نمت قواه العقلية بالعمل، لذلك لا يساورنا شك بان للأكراد القدماء البدائيين كانت لهم تصورات وتخيلاتهم والهتهم ومنها دموزي واعتقاداتهم البسيطة التي دلت عليها الكشوف الاثارية ثم اخذت معتقداتهم بالتطور والتحوير والتغيير وخاصة بعد تمكنهم من الانتقال من طور جمع القوت الى طور انتاج القوت التدريجي بعد تدجين بعض النباتات والحيوانات البرية وتعلم الزراعة والاستقرار في مجمعات سكنية اعتبرت من اقدم القرى الفلاحية في العالم في جرمو وتپه گورة وبيلوم تپه، فتطورت معتقداتهم اكثر ونتيجة التفاعل والاقتباس من مجتمعات مجاورة متطورة لذلك فان الاله طاؤوس كان في بدايته طوطما وربما كانت تسمية دموزي تحريفا له وان طاووس هو تحريف للاله دموزي الذي سمي في العصر البابلي باسم تموز.

# «بێدار»
# شاعیری نیشتمان پەروەری ناوچەی خانەقین
# ١٨٩٤-١٩٤٩

● نووسینی: هیدایەت ئەحمەد ●

## پێشەکی :-

ئەگەر بە وردی چاوێك بە گۆڤارو ڕۆژنامەو پەرتووکە کوردییەکاندا بخشێنین، ئەبینین دەیان شاعیری نەناسراو یان کەم ناسراو لە سەریان نووسراوەو لێیان کۆڵراوەتەوە، دیارە ئەو نووسینانەش بونەتە هۆی ئاشکراکردنی گۆشەیەك لەژیانو بە سەر هاتو شیعری ئەو شاعیرانەو ڕزگارکردنیان لە دونیای وون بوونو لە ناوچوون. ئەنجامدانی ئەم ئەرکە ئەدەبیّ یاتەش کارێکی ئاسان نییەو پێویستی بە ماندوبوونو کۆشش هەیە، بە گەڕان بە دوای زانیاری یادەر بارەی شاعیر لەو شوێنانەی تیایدا ژیاوە، یان بە سەردانی کردنی بنەماڵەو ناسیاوەکانو هاوەڵانی خوالێخۆش بووان: پیرەمێردی نەمر، نەجمەدین مەلا، ڕەفیق حیلمی، عەلی کەمال باپیر، عەلائەدین سەجادی. . شۆرە سوارانی ئەم مەیدانە بوونو نووسینو وتارەکانیان بە بەردی بناخەی دەزگای ئەدەبیاتی نەتەوەکەمان ئەژمێر ئەبن. ماموستاو برایانی هێژاش: عەبدولکەریم مدرسو دکتور عیزەدینو عەممەدی مەلا کەریمو محەمەد عەلی قەرەداغیو کەریم شارەزاو هەردەوێڵ کاکەیی و چەند نووسەرێکی دیکەمان شایانی ئەوەن پەنجەی شایەتیان بۆ درێژ بکرێت کە خۆیان ماندوو کردوەو دەکەن لە پێناوی زیندوو کردنەوەی بە سەرهاتی شاعیرانو کەلەپووری نەتەوەکەماندا. بەڕاستی کەلێنی باش پڕ ئەکەنەوە بە نووسینو لێ کۆڵینەوەی وردیان شاکارەکانیان، خوا لە نموونەیان زیاد کاو تەمەن درێژبن بۆ خزمەتی گەورەتر.

ئەوەی ڕاستی بێ لەم نووسینەم دا خۆم بە قوتابیەکی سەرەتایی قوتابخانەی ئەو نووسەرانە ئەزانم، چونکە بە تاسەوە زۆربەی نووسینەکانیانم خوێندۆتەوەو شتیان لێوە فێر بووم، بۆیە باوەڕم بە خۆم بوو دەست بۆ پێنوس ببەم لەم لێ کۆڵینەوەیە بنووسم.

شاعیری باسەکەمان شێخ بابا عەلی (بێدار)ە. کە زانایەکی دیندارو شاعیرێکی نیشتمان پەروەری نوێخواز بووە. تا ئێستا لێ کۆڵینەوەیەکی ئەوتۆی لە سەر نەکراوە هەڵی خۆی بلەرزێنێ چ لە بارەی بەرزی شیعرەکانیەوە، چ لە بارەی هەستی نیشتمان پەروەریێیەوە. نووسەر ئیبراهیم باجەلان یەك دوو وتاری لە سەر بڵاو کردۆتەوە، بەڵام بە کورتی دەربارەی دواوەو تێرو تەسەل نین بە گوێرەی ئەوەی کاك ئیبراهیم پێی وتم نیازی ئەوەی هەیە ئەو شیعرانەی کە لایەتی لە نامیلکەیەك داچاپیان بکات، هەوڵی زۆرم لە گەڵ بنەماڵەکەیان دا بۆ دەست هێنانی شیعرەکانی. جێی داخە کورەکانی سۆراخی ئاڵە دێرێکی شیعری باوکیان نازانن و تەنانەت دەیانگوت وێنەیان نییەو (دفتر نفوس)ە کەشی، کە وێنەی پێوە بووە تەسلیم دائیرەی نفوسیان کردوە.

## ژیانو بەسەرهاتی (بێدار) :-

ناوی: (شێخ بابا عەلی کوڕی شێخ عەبدوڵلای کوڕی شێخ عەلی کوڕی شێخ لەتیفی کوڕی شێخ سەلیمی هەنجیرانە)[1]، لە بنچینەدا ئەگەڕێتەوە سەر ئەوەی (پیر یونس)[2]، کە لە کتێبی -نور الانوار- دا باسی کراون. شێخ عەبدوڵڵای باوکی لای خانەقی لە (ئاوایی گەورە)[3] نیشتەجێ ئەبێتو لەوێش هاوسەر بۆ خۆی پەیدا ئەکاتو خێزان پێکەوە ئەنێت. لە ساڵی (١٨٩٤ز)[4] کوڕێکی ئەبێ ناوی ئەنێ (بابا عەلی)و. بە منداڵی فێری خوێندن ئەکات تا تەمەنی ئەگاتە دوانزە ساڵان، پاشان ئەینێرێتە شاری خانەقی لە خزمەت شێخ ساڵح مودەڕیسدا دەست ئەکاتە خوێندن. لە تەك ئەمەشدا بە هۆی خوێندنەوەی شیعری شاعیرەکانەوە سەودای شیعر نووسین پەیدا ئەکات، لە پێشدا تەخمیس لە سەر غەزەلی (حافظ) ئەکات و باوکیشی بە پێنوسی خۆی شیعرەکانی باباعەلی ئەنووسێتەوە. کاتێ باوکی کۆچی دوایی ئەکات دەست لە خوێندن هەڵ ئەگرێو ئەگەڕێتەوە بۆ دێکەی خۆیان. (شێخ محمد امین)ی برای (بێدار) ئەڵێت:- «بێدار دوای دەس هەڵ گرتنی لە خوێندن گەڕاوەتەوە دێ[5]کەی، خۆیان پاشان، چەند جارێك ماڵەکەیان لەم دێ بۆ ئەو دێ بار ئەکاتو ماوەیێ سەر لێ شێواو بێ کارو پیشە ئەبێ، پاشان دەست ئەکاتە

کاسبی و زەوی کێڵ و کشتوکاڵ کردن. هەروەها مەلایەتیشی ئەکرد، بەڵام نەك بۆ تەماعی دونیا بەڵکو مفتە لە ڕێگای خودادا، (بێدار)، بەو پارەی دەسکەوتی جوتیاریی پەیدای ئەکرد، دیوەخانێکی باشی هەبوو خەڵکی ئەهاتنە لای بۆ دانیشتن و پرسیار کردن و بیستنی وڵامی لە (بێدار). لە ژیانیدا چوار ژنی هێناوە لە ژنێکیان کوڕێکی لەبوو ئەمرێ، لە ژنێکی تریان کە ئامۆزای خۆی بووە سێ کوڕی هەیە ئێستا لە شاری کەلار ئەژین. (بێدار) پیاوێکی باڵا بەرزی قامەت ڕێکی جوان خاسی ڕەنگە لە سەری دەم و چاو پڕ بووە. زەلامێکی زۆر تەڕپۆش بووە، هەر پارچەیەك گران بایوایە ئەو ڤاڵ کەواو سەڵتەی لێ ئەکرد، ڕوو خۆش و سەخی تەبیعەت بوو، ڕقی لە زەلامی ڕووگرژ بوو. هەر هەژارێك ڕووی تێ بکردایە بۆ یارمەتی لە بیردە بە نائومێدی نەگەڕاوەتەوە هەرچی لە کیسەکەیدا بوایە ئەیدایە و پێی ئەوت با هەر خۆتو خوا بزانێ کە من یارمەتیم داوی. باباعەلی لە ژیانیدا گەلێ حەزی لە سواری ئەسپ کردووە و تاڕمزووری بە خێو کردنیشی ئەکرد بۆ لێشی تایبەتی و کشتوکاڵ و دیدەنی مەلا و هاوڕێکانی لەوانە: مامۆستا سەیید حەکیم، مەلا حەمە سەعیدی کولەجۆ، مەلا عەباس، مەلا عەمەدی عەولەخانی، مەلا ئەحمەدی هۆرێنی، مەلا ئەحمەدی دەکە».

ئەمەی دوایی یان بۆمردنی (بێدار) پارچە شیعرێکی نایابی نووسیوە بە ناونیشانی (تاریخی وفاتی مرحوم شیخ بابا علی غفر له) تیایدا باسی چۆنیەتی مردن و شوێن کات و هۆکەی دەگێڕێتەوە وەك لە ئەخەینە بەرچاو: خوالێخۆش بوو مامۆستا (علاء الدین سجادی) لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا ناوی شێخ بابا عەلی بێداری هێناوە، ئەویش ساڵانی (١٨٩٢-١٩٤٩ز)[۲۳]ی بۆ مێژووی لە دایك بوون و کۆچ کردنی داناوە. جا بۆ مێژووی کۆچ کردنی لەگەڵ کاك ئیبراهیم باجەلان یەك ئەگرنەوە، بەڵام بۆ مێژووی لە دایك بوونی جیاوازن. وەکو پێی بزانم کاك ئیبراهیم چونتە بنج و بناوانی بابەتەکە و خۆیشی خەڵکی ناوچەکەیە و پەیوەندیشی بە بنەماڵەی (بێدار)ەوە هەیە.. بۆیە ڕاستی یەکەی بۆ ساغ بۆتەوە.

## شێخ باباعەلی و نازناو:

شێخ باباعەلی لە سەرەتادا (بابا)ی کردوەتە نازناو لە شیعر نووسینیدا پاشان (بێدار)ی بەکار هێناوە، ئەم نازناوەش ئەدیبی پایە بەرزی کورد خوالێخۆش بوو (ڕەفیق حیلمی) بۆی داناوە (شێخ محمد امین)ی برای ئەڵێ: «شێخ باباعەلی برام هاوڕێیەکی دڵسۆزی خوالێخۆش بوو ڕەفیق حیلمی بوو لە کار و باری سیاسیدا، باباعەلی ئەندامێکی چالاکی (حزب هیوا) بوو.. جار جارە ڕەفیق حیلمی لە کەرکووکەوە ئەهاتە خانەقی بۆ چاو پێکەوتنی شێخ باباعەلی و هاوڕێکانی، وە لە گەڵیاندا کۆ ئەبوونەوە لە بارەی گیروگرفتەکانی (حزب) و بڵاو کردنەوەی مەنشوراتی حزب بە دێهاتەکانی ئەو ناوچەیەدا. هەروەها (بێدار)یش چەند جارێك لە خانەقینەوە چۆتە شاری کەرکووك بۆ دیتنی (ڕەفیق حیلمی) و لە گەڵیدا کۆ بۆتەوە. هەر ئەویش نازناوی ناوی (بێدار)ی لێ نا، پاش ئەزانم ناوی نهێنی شێخ باباعەلی لە (حزب هیوا)دا (بێدار) بوو.. هەر لەو دەمەدا بەردەوام گۆڤاری (گەلاوێژ) و بڵاوکراوەی سیاسی تر لە گەیشتنە دەستی، ئەویش بە ناوچەکەدا بڵاوی ئەکردەوە بە سەر هاوڕێکانیدا».

## بێدار و شیعر:

بێدار لە ماوەی ژیانیدا شیعری زۆری داناوە، کارەسات و ڕووداوەکانی ئەو سەردەمە لە ناو شیعرەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە. بە تایبەتی شیعرە نیشتمانییەکانی کە تێیدا هانی گەلەکەی داوە بۆ ڕزگار بوون لەو بارودۆخە ئاڵۆزەی کە تیایدا ژیاوە، هەروەها دژی ئیمپریالیزم و نۆکەرانی. جێی داخە (بێدار) لەو هەموو شیعرانەی کە بە درێژایی ژیانی وتوویەتی ژمارەیەکی زۆر کەمی لێ ماوەتەوە. لەوانە چەند پارچە هەڵبەستێکی کە لە ژمارەکانی گۆڤاری (گەلاوێژ)دا بڵاو کردۆتەوە.. بۆ لە ناوچوونی دیوانە دەستنووسەکەی (بێدار)، نووسەر محەممەد عەلی قەرەداغی لە پێشەکی دیوانی جەلالی)دا نووسیویە ئەڵێت: «دۆستی خۆشەویستم کاك (ئیبراهیم باجەلان) بۆی گێڕامەوە وتی: تەمەنم یەك ساڵان بوو کە باوکم کۆچی دوایی کرد، باوکم خوێنەوار بوو، لەگەڵ خوێندەوارییەکەیشیا دەستی خۆشنووسی و وێنەکێشانی هەبوو، پاش لە دونیا دەرچوونی پڕ سندووقێکی گەورە کتێب و دەستخەتی لێ بەجێ مابوو، ماوەیەك سندوقەکە لە ماڵەوە کەوتبوو، دوایی کەس و کاروتیان: ئێمە چاومان بەرایی نادا ئەم سندوقە لەم ماڵەدا بێت ئێمە هەر چەند چاومان پێی بکەوێت وەك کۆسمان کەوتبێت وایە! هەڵیان سندووقەکەیان دایە کۆڵیان داو بردیان دایان بە دەم ئاوی (سیروان)ەوە کاك ئیبراهیم ئەڵێ کاتێ گەورە بووم و فامم کردەوە پرسیم وتیان ئەو سندوقە گەلێ دەستخەتی نایابی تێدا بووە، دیوانی شیعری باوکم خۆی ـ تێدا بووە، دیوانی باباعەلی (بێدار) و چەند شاعیری دیکەی کوردی تێدا بووە»[۳] بێدار جگە لە زمانی کوردی فارسی عەرەبی و تورکیشی زانیوە و شیعریشی پێ داناوە، بە سەرهاتی خۆی لە هۆنراوەیەکی درێژدا بە زمانی

فارسی داناوه جێی داخه ئەویش لە ناوچووە. ئەگەر لەو شیعرانەی (بێدار) بکۆڵینەوە، ئەتوانین بیانکەین بە دوو بەشەوە: بەشی یەکەمیان سەرەتای دەست پێ کردنی شاعیرێتی (بێدار) پیشان ئەداتو کاریگەری شیعرەکانی نالیو سالمو مەولەویو کوردیو حاجی قادری پێوە دیارەو نەشی توانیوە لە وشەی بێگانە خۆی رزگار کات ئەو شیعرانەش کەلەو قۆناخەدا وتوونی ئەگەڕێنەوە بۆ دەوروبەری جەنگی یەکەمی جیهان. بەشی دووەمیشیان کە ئەگەڕێنەوە بۆ سەرەتای جەنگی دووەمی جیهان گۆڕانێکی تەواویان بە سەردا هاتووە چ لە بارەی بەکار هێنانی وشەی سادەی کوردییەوە چ لە بارەی ناوەڕۆکەوە. بێداری شاعیر لەم قۆناخەدا وەکو ئەحمەد موختارو وفایی بێکەسو قانیعو ئەسیریو شامۆ هەنگاوێکی نیشتمان پەروەرانەو شۆڕش گێڕانەی ناوە، بەشدار بوونی (بێدار) لە (حزب هیوا)دا، زیاتر هەستی نیشتمانی بزواندووە بۆیە لەم قۆناخەدا بایەخێکی زۆری داوەتە هەڵبەستی نیشتمانی.

## بێدار و شیعری نیشتمانی:

بێدار لە شیعری نیشتمانیدا دەستێکی باڵای هەبووە وەکو شاعیرە شۆڕش گێڕو نیشتمان پەروەرەکانی تری سەردەمو پێش خۆی هاتوونە مەیدانە ئەمەندە ئاوو خاکی نیشتمانی خۆی لا پیرۆزو خۆشەویست بووە ئەگەر سەوداي سەیرانی بیوایە.. ئەوا دیدەنییەکی شاری سولەیمانی لە لای ئەو لە پاریسو خۆشتر بوو، وەك لەم ... شیعرەدا دیارە:

«نیازی ... ئەبەم دەمێ ویستی بکەم یادی هەوا گۆڕی

ولم پاریس وەیا لوبنان؟ وتی (بێدار) سولەیمانی» :

(بێدار) بیروباوەڕێکی تەواوی هەبووە بە مەسەلەی نەتەوایەتی بۆیە پڕ بە دەم هاوار ئەکاتو ئەڵێت:

«لە ڕۆژێکا کە یەزدان ئادەمی هێنایە دونیاوە

لە هەر قەومێ کە قەومانێ بەقەومێ خۆی نەجات داوە

کە مێژوو باس ئەکاتو حاڵی حازر ئێمە ئەیبینین[9]

نییە هیچ کارەساتێ وا لە قەومی ئێمە ڕوویداوە

بە بانگی ئاش بەتاڵی چەرخ هەموو باراشی خۆی هاڕی

لەبەر بێ هاودەمی بار ئاشی ئێمە هەر وەها ماوە»

(بێدار نەك هەر نیشتمانی خۆش ویستووە، بەڵکو خزمەت کردنی هاو زمانەکانی ناوتەوخاکەشی بە ئەرکێکی پیرۆز زانیوە وەکو خۆی ئەڵێت:

«دەمێ خزمەت بە یارانم بە تەختی خوسرەوی نادەم

کە نانو ئاوی بێگانە بە چەشنێ دانەوو داوە

بە شاهی زیندی خۆت (بێدار) بناڵە تا وەکو ماوی

لە خاکی کوردستان بەرەکە ڕوحی کوردی تێکەڵاوە»[10]

(بێدار)ی نیشتمان پەروەریش شانبەشانی ئەحمەد موختار لە دەشتی بنکورەی ناوچەی خانەقینەوە دەنگی بەرز ئەکاتەوەو ئەڵێت:

«ناڵەیێکی زۆر بە سۆز دێ وا لە جەرگم کار ئەکا

ئێ گەیشتم پڕ بە دەم خاکی وەتەن هاوار ئەکا

دادو فریادی لە ئێشی صحبەتی بێگانەیە

دەردەدارە بۆیە ناڵەی عالەمی بێزار ئەکا»[11]

وەها ئەڵێت:

«لە ڕێگای عەشقی تۆدا بمکوژن لام وایە قوربانە

بە قوربانت ئەوەم لەم جەژنە قوربانە قوربانە

بە کەعبەی بۆ نەزانم گەر ئەتۆ تێفکری ئەی گیانە

ئەزانی چاوەکەم حوبی وەطەن ئێکەڵ بە ئیمانە؟»

(بێدار)ی وردبین بە ئانەی سەرشانی زانیوە کە بێگانەکان نانو نیعمەتی نیشتمانی بخۆن:

«لە سەر سفرەی خومان ئێستەکە دیلی دەستی بێگانەین

بە ئیمازو نیعمەتی ئێمە ئەژین واقەومی بێگانە

بە تەلقین زیندووە مردوو، بە بانگی هەڵ ئەمێ نووستوو

بەشەق گەر تۆ ئەبێ وریا، ژیانت زانە کەی ژیانە؟»

هەر وا ئەڵێت:

«کەسی دانا بە داتایی لەوەی نادانە داناکا

سلاحی یەك دڵی پێشخەمن عەدو وەك سەگ لە دروتانە

دەبێکە تۆ خەیاڵت هەر لە ئەطوارت لەدەی (بێدار)

زەمانە دەم دەمە وا دیارە هەر دەم ڕۆژ لە چەرخانە»[12]

بێدار وەکو شاعیرێکی شۆڕش گێڕو ئەمەکداری هانی هاو زمانەکانی ئەدا بۆ دەرپەڕاندنی بێگانە وەکو ئەڵێت:

«ناڵەیێکی زۆر بە سۆز دێ وا لە جەرگم کار ئەکا

ئێ گەیشتم پڕ بە دەم خاکی وەتەن هاوار ئەکا

دادو فریادی لە ئێشی ستەمی بێگانەیە

دەردەدارە بۆیە ناڵەی عالەمێ بێزار ئەکا

بانگ ئەکا ئەی ... ل خیرەت باری حورمەت لا بدەن

دەوری خەفڵەت زیللەتە وا فیکری میللەت کار ئەکا!»

«لەی وەتەن رووحو دڵو گیانت لە سەر دانێم کەمە
چونکە مایەی فەخری ئێمەی کێ لە هەق ئینکار ئەکا،

لاوی خۆم تۆ بانگەو فریادت لە دەس خۆت بەرمەدە
رۆژی رەش پێکەوە. بزێن کێ دەردی کێ تیمار ئەکا
چەندە دڵ پڕ ئێشە (بێدار) دەستی ناچێ ناعیلاج
رۆژی سەد نەفرەت لە دیاری ناحەزی غەددار ئەکا»[13]

(بێدار)ی شاعیر و مرۆڤ هەر بۆ ئەو دەمەی نەئەنووسی کە تێیدا ئەژیا، بەڵکو ئاوڕی لە منداڵە جگەر گۆشەکانیش ئەدایەوە، چونکی بە هیوای پاشە رۆژی ئەزانی، بۆیە هەستێکی کوردانەی دارشتووە. کەمێکی منداڵان پێ زاخاو بدرێ و بدرێو هەستی نیشتمانیان پێ پتەوتر بکرێت. چۆن لاوو خاکی خۆیان خۆش بوێ و لایان پیرۆز بێت. بێدار وەکو بەماڵەی لەیگێرنەوە.. ئەم هۆنراوە (لایە لایەی) بۆ (ساڵح)ی کوری وتووە:

«هەی لایە لایە کۆرپەی ئەو جوانم
تازە گوڵ خونچەی باخی ژیانم
وە لایەی کوردی لایەت بۆ ئەکەم
تا بلێی زێگەی وەك من ئێنەگەم

بە درێژایە شەو هیچ خەوت نایە
هەمی من هەمە تۆیش لە دڵنایە
هەی لایە لایە رۆڵەی نازدارم
تۆ چۆنت زانی من دەردە دارم

گوێ لە واتەم کە بەڵا هۆشت بێ
مێژووی کوردستان حەڵقەی گۆشت بێ
تۆ بە خێو ئەکەم بۆ یارمەتی خەڵك
بۆ هاو زمانت لەپێ بشێ کەڵك

هەی لایە لایە رۆڵەی شیرینم
بەو هیوای خۆمە باخوا بتبینم
هەر کەس بۆ قەومی راستی لێ نایە
وەك کەشکۆلێ کون کاکە خۆی تێدایە
لایەت بۆ ئەکەم بەو شەرت بیزانی
بۆهاو خوێنی خۆت قوچی قوربانی

هەی لایە لاوم لای لایە
لە قوژبن نەگبەت رزگار بوینایە
رازی لای لایەت لە دڵ جێگیر بێ
زەبوونی کوردت هەر کاتێ لە بیر بێ

لە گەڵ شیر بیخۆ ئەم داستانە
وەك ماران گازە ئێشی بێگانە
هەی لایە لایە کۆرپەی رەنگینم
بۆ خزمەتی گەل خۆزگە بتبینم

لەتۆ زێر کەلەی نەرەی شێران
نرخی وڵاتت زەریف بزانی
رۆڵە سەربەستیت بەرزی وڵاتە
گیان فیدای وەتەن تاجو خەڵاتە
هەی لایە لایە کۆرپەم لای لایە
ئاخ رۆژێ زوورتر تێبگەیشتنایە

خەوی غافڵ پێشەی نەزانە
سەودای نیشتمان مایەی ژیانە
هەمیشە تکام لە لای یەزدانە
تۆ بێیتە بەرهەم بۆ قوتابخانە»[14]

## بێدار و شیعری دڵداری:

داخەکەم لە شیعرە دڵ دارییەکانی (بێدار)، تەنها یەك هۆنراوەم چنگ کەوت لە نووسینی (شێخ محمد امین)ی برای شاعیرەوە کە بۆی خوێندمەوەو منیش نووسیمەوە. ئەم هۆنراوەیە لە وەختی خۆی کاك لیراهیم باجەلان لە ژمارە (٢٠)ی گۆڤاری (بەیان)دا بڵاوی کردۆتەوە، بەڵام چەند دێرێکی ناتەواوە. ئەگەر بە وردی تەماشای ئەم هۆنراوەیە بکەین.. ئەبینین (بێدار) شاکارانە بە وشەی جوانو رازاوە داپڕشتووە وەکو ئەیگێرنەوە کارەساتێکی دڵ تەزێن کاری کردۆتە سەر (بێدار) ئەویش بەم جۆرە بووە: (بێدار)ی دڵ تەڕو هەست ناسك گیروودەی عیشقی ئامۆزایەکی خۆی ئەبێت، بە نیازی ئەوەی بچێتە خوازبێنی و مارەی بکات.. لەگەڵ (شێخ ئەنوەر)ی برای لە (بنکوورە)وە[15] ئەکەونە رێ بەرەو دێی (سەی خەلیل)[16]، لە رێگا جار جارێك مەلە (زیقاوڵە) یەك بە باڵ

سەریانەوە هاتو چۆ ئەکاتو پڕ بە دەنگ ئەزیڤێنێ. (بێدار) ئەڵێت: ئەتورەی برام ئەم مەلە زیقاوڵە ئەڵێی هەواڵێکی پێیە؟! هەر لە ڕێگادا پێش ئەوەی بگەنە ماڵی کچی مامی، توشی ڕێبوارێك دێنو هەواڵی بە شودانی کچە ئامۆزاکەیان پێ ئەدرێتو، ئەم هەواڵە دڵ ئەزێنە گربەر ئەداتە هەناوی بێدار بە ناکامی ئەگەڕێنەوە دواوە. ئەم کارەساتە کارێکی زۆر ئەکاتە سەر بێدارو ئەبێتە هۆی لە دایك بوونی پارچە هۆنراوەیەکی ئەمەندە ناسكو نایاب.. کە بتوانێ شان بە شانی هۆنراوەکانی مەولەویو وەلی دیوانەو صەیدی خۆی بنوێنێت، ئەمەش دەقی پارچە هۆنراوەکەیە:

«فەلەك زەبوونم، لەلەك زەبوونم
پەی دیشت (لەیل) خەیڵێ زەبوونم
شەیداو پەشێو حاڵ وێنەی مەجنوونم
موحەییەر نە دەور چەرخ گەردوونم
عەزمم کەرد وە لای شای تیەو سالان
ڕووم کەرد نە بارگەی گوزەرگای خێلان
هەر چەن مەپرسام چە ڕایبواران
بێنۆ بە دەستم خەبەر چە یاران
یەکێ چێ تەیران وەرووی حەواوە
خێزاو ستێزا ئاما چە لاوە
بە ئاواز موات دەروون پڕ چە خار
مەگێڵۆ سەحرا پەی دیدار یار
جەفات پێ سەفان خاکت بۆ وە سەر
یە خەیڵێ وەختەن هێڵ کەردەن گوزەر
ئەزانام ئازیز کۆچش کەردەن
ئای بەد بەخت ویم کۆچش ویەردەن
ئازیز تۆ ئاوای کۆچ خەیرت بۆ
من مام پەی سزای جەفای دەرد تۆ
بە وێنەی مەجنوون لەیل گوم کەردە بۆ
هەر لەیل لەیلمەن چە سای کەژو کۆ
پەی گەردن ساغ مینا ئاسای تۆ
پەی کوکای زوڵفان دەور گۆنای تۆ
واوەیلا کۆچ کەرد ئەو ئەمام نۆ
ئومری تە شاخای تەیران ن داخان
ماتەمەن پەری شای بەرز دەماخان
بولبولان چەشاغ گوڵاو نۆشان بۆ
تازیەشانەی پەری باڵای تۆ»

## بێدارو شیعری کۆمەڵایەتی:

لە شیعرە کۆمەڵایەتیەکانی (بێدار)، تەنها دوو دێڕم چەنگ کەوت کە تیایانا بە پێویستم زانی بیانخەمە پێش چاوی خوێنەران. لەم دوو دێڕەشدا وەکو بۆمان دەر ئەکەوێ.. (بێدار) دژ بە هەموو کەسێك یان تاقمێك بووە کە بوونەتە کۆسپ لە بەردەم ڕەوڕەوەی بەرەوپێش چوونی کۆمەڵدا. ئەوەتا ڕوو بە ڕووی مەلاو واعیزەکان بووەتەوەو ڕەخنەی توندو تیژی گرتوتە بڕێکیان کردووە. لەم ڕووەوە (بێدار) لەگەڵ مامۆستای خوالێخۆش بوو (فایق بێکەس)ی ئەمردا یەك ئەگرنەوە چونکە (بێکەس)یش ڕەخنەی زۆری ئاراستەی بڕێ لە شێخو مەلاو سۆفیو واعیزەکان کردووەو پێی وتوون کە هەر ئەوانن بوونەتە کۆسپو هۆی دوا کەوتنی کۆمەڵ. وەکو لەم کۆپلەیەدا ئەڵێت:

«هەر دوو گوێم پڕ بوو لە باسی وەعزو سەرفیترەو زەکات
هەر هەواڵی حەشرو نەشرم پێ ئەڵێ تاکوو مەمات
بەسیە لەم مەوزووعە لادە فێری نوێژ بوو کائینات
خوتبەیێکی ئیجتیماعیکم پێ بڵێ بۆ ژینی حەیات
ئەی مەلا تۆ بێ خودا لەم فیکرە کۆنە لابدە
فەننی تازەم پێ نیشان دە بۆ تەرەققی ڕێی نەجات»

(بێدار)یش هەر چەند خۆیشی مەلایەتی کردووە، کەچی داش بەزیوەتە سەر مەلاو واعیزەکانو ڕەخنەی ئەوەی لێ گرتوون کە هەر ڕابردوو ئەگێڕنەوەو ئاوڕێك لە سەردەمو داهاتوو نادەنەوەو ئەڵێ:- ئەوە ئەبێ هەر خەڵکی فێری خواردنو خەو ئەکەن. ئەبێ ئەوەش بڵێین (بێدار) ئەگەر واعیزشی کردبێ بۆ تەماحی دونیا نەبووە یان بۆ گوزەرانی ژیان وەکو لە سەرەتادا ڕامان گەیاند، چونکە (بێدار) خۆی دەس ڕۆ بووە پێویستی بە داهاتی واعیزی نەبووە. ئەوەی بێدار ڕێستوویەتیو لای گرنگ بووە. توانیویەتی بە بۆنەی واعیزی یەکەیەوە چەندەها باسی ئیشتمانیو ئەخۆشییەکانی ناو کۆمەڵ بۆ خەڵکی ئاشکرا بکات. با بزانین لەم دوو دێڕە ئەڵێ چی:

«لەی (واعیظ) لە گوێ ناکەم لە ڕێی ژینا ڕ. ن کردم
بە حیلە چاوی بەستم گۆشەگیری فوزیی کردم
لە خۆیەوە ژینی پێشان دام چە ژینی ژینی حەیوان
لە دەرسی (مەعریفەت) هەر فێری خەوتنو خواردن کردم»

وەکو وتمان (بێدار) لە ماوەی ژیانیدا پەیوەندی بەگەڵێ لە زانایانی دینیو ئەدەب دۆستانەوە بووەو لە دڵیاندا ژیاوە، بۆیە دوای کۆچ کردنیشی لە یادیان نەچووە، یەکێك لەوانە (مەلا ئەحمەدی دەکە)» کە پارچە هەڵبەستێکی نایابی داناوە بە بۆنەی کۆچی دوایی (بێدار)ەوە، لەبەر گرنگی هەڵبەستەکە حەزم کرد دەقی هۆنراوەکەو وێنەی دەستنووسەکە بخەمە پێش چاوی خوێنەرانی ئازیز. ئەمەش هەڵبەستەکەیە:

«تاریخی وفاتی مرحومی شیخ بابا علی غفر لە»
دەردی سمومی مەرگە لە باغی شەرافەت بری ئەمام

وەخـتی ئـەمـووزە کـوچـی عـەزیـزە بـرا عـەقـڵو فـام
داغـی خـەزانی گـوڵی گـوڵـشـەنی فـەرەح نـرا بـە دەمـاغ
بـولبـول خـەمـینە مـانـەمـینـە لـە شیـنـە هـەمـوو سـوبـحو شـام
بـابـا عـلي نـەبـیـرەی نـیـمـامـی عـەلی بـە فـەزڵو نـەسەب
بـە کـەسـبو ڕاسی ئـەوەککـل گـەیشتـە حـوسـنی خیـتـام
ئـەسـڵی شـەجـەرەی سـلـسـلـەی سـابـیـتـە دیـارە لـە بـیـارە
کتیبی (نـور الانـوار)ە بـەبـانـیـان لـەکـا بـە جـەدی ئـەمـام
لـە (پیر یـونـس)و ئـەهـدەل شـازلی هـەتـا ئیـمـامی حـەسـەن
ئـەسـەب (حـسن)ی گـەمـوو عـولـەمـاو ئـەولیـاو زوواتی کیـرام
دەردی وەفـاتی زەحـیـرە لـە بـەغـدا وە بی کـەسو غـەریـب
(لیلة القـدر)و جـومعـە بیـستو حـەوتی ئـەشـرەفی ئـەییام
هـەر یـەك لـەمـانـە ڕوتـبـەی عـالیـیـە دەرەجـاتی شـەهـادەتـە
(الحقـتا)[٢١]م) ئـایـەتی دەرەجاتی زوریـیـەتە وەکـو جـەدودی عیـزام
نیـدای (ارجعي)[٢٢] هـاتـە سـەر ڕوحی ڕۆیـشـتـە جـیـنـان
وجـوودی لـە بـنـکـورە لای بـابـومـامـی گـرتی مـەقـام
. . . . . . . . . سـەروەرە لـە بـو قـەومـی ئـیـحـمـەدی
بـابـا ئـەنـومـرە بـرای ئـەمیـنـە حـوسـەینـە بـزین بـە ئیـمـرام
حـروفی مـەسـرەعـی سـانی بـە ئـاوی ڕەمـزی سـالی وەفـاتـە
(کـان دخـول بـابـا عـلي دار الـسـلام بـالـعـبـام)
مایەوە بڵێین (بێدار)ی نیشتمان پەروەرو شاعیر ئەو دڵەی کە پڕی بوو لە خۆشەویستی خاك و ئاوی کوردستان بوو، لە (٢٢)ی تەمووزی ساڵی (١٩٤٩)[٢٣] لە شاری بەغدا، لە نەخۆشخانەی (دار السلام) بە نەخۆشی زەحیری کۆچی دوایی ئەکات و تەرمە ساردو سڕەکەی ئەهێننەوە بۆ دێکەی خۆیان و لە سەر وەسیەتی خۆی لە گۆڕستانی (ئیمام سەرپەنی)[٢٤] بە خاکی ئەسپێرن و لەوێ سەری یەك جارەکی ئەنێتەوە.

لە کۆتاییدا هیوادارم توانیبێتم تارادەیەك، شۆرەسواری مەیدانی شەری نیشتمانی (بێدار)ی شاعیر بە نیوەی بەرێز بناسێنم لەگەڵ سڵاوم دا بۆ گیانی پاکی.

## ★ پەراوێزو سەرچاوەکانی ئەم باسە ★

١ـ بڕوانە گۆڤاری بەیان، ژمارە (٢٠) کانوونی یەکەم، ساڵی ١٩٧٤. ل٥.
٢ـ بڕوانە پاشکۆی ڕۆژنامەی العراق، ژمارە (٦)، ساڵی ١٩٧٧ ل٧.
٣ـ گوندێکە سەر بە ناحیەی قۆرەتوو ـ قەزای خانەقی ـ لەو ناوچانەدا بە (دێ) ئەڵێن (ئاوایی).
٤ـ هەمان ژمارەی پێشووی گۆڤاری بەیان، ل٥.
٥ـ برای شێخ باباعەلی (بێدار) موتەمەنی لە (٧٠) ساڵ زیاتر بووە وەکو من پێی بزانم ئەمیش دەستی شیعر وتنی هەیە، گەلی لە شیعرەکانی (حافظ)و (سەعدی) لە بەرەو بە کوردیش ماناکەی شی ئەکاتەوە. لە قسەکردندا زۆر لە سەرخۆو بە تام و لەززەت ئەدوێ، کە ئەچیتە لای بۆ گفتوگۆ حەز ناکەی بەجێی بێڵی، هیوادارم گفتوگۆیەکی تایبەتی لەگەڵا بکەم دەربارەی ژیان و شیعرەکانی.
٦ـ مەبەست لە (ئاوایی گەورە)یە.
٧ـ بڕوانە عەلائەدین سەججادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی یەکەم، بەغدا، س ١٩٥٢، ل٥٥٠.
٨ـ بڕوانە پێشەکی دیوانی جەفایی، کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەی، محەمەد عەلی قەرەداغی، چاپخانەی شەفیق، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٠.
٩ـ لە شێخ (محمد امین)ی برای شاعیر وەرگیراوە.
١٠ـ سەرچاوەی پێشوو.
١١ـ بڕوانە دیوانی ئەحمەد موختار جاف، ئامادەکردنی پرۆفیسۆر عیززەدین مستەفا ڕەسول ـ بە کۆششی ئەفراسیاب ئەحمەد موختار، چاپخانەی الادیب، بەغدا س ١٩٨٦، ل١٣٤.
١٢ـ پاشکۆی ڕۆژنامەی العراق، ژمارە (٦)، س ١٩٧٧، ل٧.
١٣ـ دیوانی ئەحمەد موختار جاف، ل٨٨.
ڕۆژنامەی العراق، ل٧.
١٤ـ گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە (٢) شوبات ١٩٤٤، ساڵی پێنجەم، ل٣٤ـ٣٥.
١٥ـ هەورێکە پێك هاتووە لە چەن دێهاتێك جێ نشینی هۆزەکانی تاڵەبانی و جورو پاجەلانە، ئەکەوێتە ژووری شاری خانەقینەوە.
١٦ـ گوندێکە بە شەش کیلۆمەترێك ئەکەوێتە ژووری شاری کەلارەوە.
١٧ـ ئەم پارچە هۆنراوەیەم لە شێخ (محمد امین)ی برای شاعیرەوە دەس کەوت، ووتی هۆنراوەکە لەمە زۆرترەو کەچی هەر ئەوەندەیەم لەبەر ماوە.
١٨ـ ئەم دوو دێڕەم لە شێخ (محمد امین) وەرگرت.
١٩ـ خوالێخۆش بووی ناوبراو زانایەکی دینی ئێ گەیشتوو ناسراوی ناوچەی خانەقینە، مەلا ئەحمەد پەیوەندییەکی پتەوی هەبووە لەگەڵ (بێدار)دا، لە مەیدانی شیعریشدا دەستی هەبووە، جێی داخە تائێستا شتێکی لە بارەوە ئەنووسراوە بە خوێنەران بناسرێ.
٢٠ـ ئەم پارچە شیعرەم لە ئەندازیار (سعد الدین محمد امین)ەوە دەست کەوت کە برازای (بێدارە)، شیعرەکەم بە ڕێنووسی ئێستای کوردی نووسیوەو چەن وشەیەکیش لە دێڕێکا بۆم ئەخوێندرا بەوە خاڵەم بۆ داناوە.
٢١ـ نووسەری شیعرەکە ئەمەی بە پەراوێز داناوە بۆ ئاماجە بە ئایەتی (الحقنا بهم ذریتهم).
٢٢ـ نووسەری شیعرەکە ئەمەی بە پەراوێز داناوە بۆ ئاماجە بە ئایەتی (یاایتها النفس المطمئنة ارجعي الى ربك راضية مرضية).
٢٣ـ بڕوانە ژمارە (٢٠)ی گۆڤاری بەیان، س ١٩٧٧، ل٦.
٢٤ـ گۆڕستانێکی نزیك بە دێکەی خۆیان و ئەکەوێتە ڕۆژئاوایەوە.

# ڕۆنی ڕووەکی و ئاژەڵی و پیشەسازییەکانیان

دوکتۆر ذنون محمد پیرباڵی

پرۆفیسۆری کیمیا کۆلێجی زانست زانکۆی بەغدا

## پوختەی لێکۆڵینەوە

ڕۆنی خواردن ماددەیەکی سەرەکی خۆراکی مرۆڤە و دوو جۆری سەرەکین. یەکەم ڕۆنی شل واتە (زەیت)، دووەم ڕۆنی توند واتە ڕۆنی ئاژەڵی وەکوو ڕۆنی ماسی مەڕ و بزن و مانگا و هەموو بەرهەمەکانی شیر، هەروەها ڕۆنی بەزر و دونگ و چەوری گۆشت.

باسی ئەم لێکۆڵینەوەیە دەربارەی پێکهاتوی ڕۆنە بە هەموو جۆر و جنسەکانیەوە. هەروەها باسی پیشەسازی ڕۆنی خواردنە بەتایبەتی ڕۆنی (زەیت) واتە ڕۆنی ڕووەکی.

ئەمانەو هەندێك لایەنی تر کە پەیوەندی بە ڕۆن و زەیتی خواردنەوەیەوە هەیە لەم لێکۆڵینەوەیەدا باسی دەکەین.

## سەرەتا

بێگومان ڕۆن و چەوری بەشێکی گرنگە لە بەشەکانی خواردن. خواردنەکان بەگشتی دابەش دەکرێنە ئەم بەشانەی خوارەوە.

١ . کاربۆ هیدرات

٢ . پرۆتینەکان

٣ . ڕۆن و چەوری - واتە ڕۆنی ڕووەکی و ئاژەڵی

٤ . ڤیتامینەکان.

٥ . ئاو و خوێ

یەکەم زاناکە لە پێکهاتوی کیمیایی ڕۆن و زەیتی خواردنی لێکۆڵیوەتەوە دوکتۆر مایکل چیڤەرێل[1] بوو لەفەرەنسا. هەموو ڕۆنێکی خواردنەکان چ شل بێت (زەیت) یان توند بێت هەموو پێکهاتوویەکی تایبەتیان هەیەو لەکیمیادا پێی دەڵێن (ئیستەر)[2]. ڕۆنەکان پێکهاتوون لە ئیستەری گلیسرین لەگەڵ چەند ترشێکی کاربۆکسیلی تایبەت بە ڕۆن و چەوری.

ئیستەرەکانی گلیسرین بەناوی (گلیسراید GLYCeride) ناسراون و هێمای خوارەوەیان هەیە (وێنە - ١).



وێنە - 1

شیاوی باسە هەموو ڕۆنە شلەکان واتە (زەیتەکان) بەرهەمی ڕووەکین کەچی ڕۆنی (توند) ڕۆنی ئاژەڵین ـ لێرەدا پێویستە زیادەتر ڕوونی بکەمەوەو بڵێم: هەموو ڕۆنێکی (توند) ئاژەڵی نییە چونکە هەروەکوو لەکۆتاییی ئەمباسە باسی دەکەین بەهۆی کارلێکی کیمیایی دەتوانرێت ڕۆنی شل واتە (زەیت) بگۆڕێتە باری (رەقی). واتە ڕۆنی (توند) وەکوو ڕۆنی (راعی)[3] و ڕۆنەکانی تری ناو بازاڕ.

زۆربەی ڕۆنی شل واتە (زەیت) لەناو تۆوی هەندێك ڕووەکدا هەیە وەکوو تۆوی گوڵەبەڕۆژەو تۆو گوێزو تۆو پەموو. هەندێك جار زەیتەکە لەناو میوەدا هەیە وەکوو زەیتی زەیتوون.

## جیاکردنەوەی (زەیت) لەڕووەك

چەن جۆر تەکنۆلۆجیا هەیە بۆ جیاکردنەوەی (زەیتی ڕووەکی) لە مەڵبەندەکانی:

١ . بە هۆی گوشار[1]: واتە تۆوەکان ناوکەکانیان دەردەکرێن و لەئامێرێکی گوشار دەخرێنە سەریان بۆ ئەوەی ڕۆنەکەی ناوی دەربچێتە دەرەوە لەپلەی گەرمی ئاساییدا.

٢. بەهۆی گوشارو گەرمی پێکەوە: لەم تەکنەلۆجیایەدا گوشار دەخرێتە سەر ناوکەکان لەهەلمەیەکی گەرمی بەرزداو بەئاسانی زەیتەکە بەرەولا دەبێت.

٣- بەهۆی تواندنەوەیەکی گونجاو[٤] لێرەدا بەزۆری مادەی هیکسان **HEXANE** بەکار دەهێنن بۆ جیاکردنەوەی زەیت. تەکنۆلۆجیای یەکەم واتە بەهۆی گوشاری سارد رۆنێکی بەش سروشتی دروست دەکات بەلام بەرهەمەکەی کەمەو تەکلیفی زۆر دەکات. لەلایەن تریشی تەندروستییەوە زەیتەکە بەنرخە چونکە هەمو ڤیتامینەکان تیایدا دەمێننەوە.

جیاکردنەوەی زەیت بەگوشاری گەرم بەرهەمێکی زۆرتر ئەدات بەلام لەبارەیەک لەڤیتامینەکانو مادە بەسوودەکانتر دەفەوتێت بەگەرمی.

تەکنۆلۆجیای سێیەم واتە جیاکردنەوەی (زەیت) بەهۆی تواندنەوەی هیکسان لەهەمو تەکنۆلۆجیاکان باوترە چونکە لەبارێکی زۆر لە رۆنەکە دەگرێتەوەو تەکلیفیشی کەمترە. لەلایەکی ترەوە رۆن ئالۆزمێل بەگەرمی دەگیرێتەوەوبە تایبەتی لە بەزرو دولکەو پیو، بەلام زۆربەی رۆنەکان بۆ پیشەسازی سابوون بەکاردەهێنرێن.

## ترشەکانی رۆن یان چەوری[٦]

هەروەکوو گوتمان هەموو جۆرە رۆنێک یان زەیتێک پرێتیە لە ئیستەری گلیسرین. واتە جیاوازی نێوان جۆرەکانی رۆنو زەیت بەهۆی جیاوازی جۆری ترشەکانی ئیستەرەکانیەوەیە. ترشەکانی ترش دەکرێنە دوو بەشەوە:

(١) ترشی تێر[٧] واتە **Saturated Fatiy acids**

(٢) ترشی نە تێر[٨] یان ترشی تێرنەکراو واتە **Unsaturated Fatiy acids**

وێنە - (٢) هەتا وێنە (٤).

هێمای کیمیای ترشە تێرەکانی چەوری نیشان ئەدەن:

$$CH_3-(CH_2)_{10}-COOH$$

(ترشی لۆریک) وێنە - 2

$$CH_3-(CH_2)_{14}-COOH$$

ترشی (پالمیتیک) وێنە - 3

$$CH_3-(CH_2)_{16}-COOH$$

ترشی (ستیاریک) وێنە - 4

هێمای ترشە تێرنەکراوەکان واتە (نەتێرەکان) کەلەناو رۆنو چەوریدا هەن ئەمانەی خوارەوەن (وێنە: ٥-١٠):

$$CH_3-(CH_2)_7-CH=CH-(CH_2)_7-COOH$$

(ترشی ئۆلیک) وێنە - 5

$$CH_3-(CH_2)_4-CH=CH-CH_2-CH=CH-(CH_2)_7-COOH$$

(ترشی لینۆلیک) وێنە - 6

$$CH_3-CH_2-CH=CH-CH_2-CH=CH-CH_2-CH=CH-(CH_2)_7-COOH$$

ترشی (لینۆلینیک) وێنە - 7

$$CH_3-(CH_2)_3-CH=CH-CH=CH-CH=CH-(CH)_7-COOH$$

وێنە - 8

$$CH_3-(CH_2)_3-CH=CH-CH=CH-CH=CH-(CH_2)_4-C(=O)-(CH_2)_2-COOH$$

(ترشی لیکانیک) وێنە - 9

$$CH_3-CH_2-CH=CH-CH=CH-CH=CH-CH=CH-(CH_2)_7-COOH$$

(ترشی پاریناریک) وێنە 10

خشتەی ١٠-١

## پێکهاتوی چەند ڕۆنێکی ڕووەکی و ئاژەڵی

| ناوی ڕۆن | | ژمارەی سابون | ژمارەی یۆدی | ترشە چەورییەکانی ڕۆن | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١. ڕۆنی ڕووەکی | | | | پالمیتیک | ستیاریک | ئۆلییک | لینۆلییک |
| ڕۆنی گوێزی هیند | | ٢٦٠-٢٥٠ | ١٠-٨ | ١٠-٤ | ٥-١ | ١٠-١ | صفر-٢ |
| ڕۆنی دار خورما | | ٢١٠-١٩٦ | ٥٨-٤٤ | ٤٣-٣٤ | ٦-٣ | ٤٠-٣٨ | ١١-٥ |
| زەیتی زەیتون | | ٢٠٠-١٨٥ | ٩٤-٧٤ | ١٥-٥ | ٤-١ | ٨٤-٦٩ | ١٢-٤ |
| زەیتی فستق عەبید | | ١٩٥-١٨٠ | ٨٦-٨٣ | ٩-٦ | ٦-٢ | ٧٠-٥٠ | ٢٦-١٣ |
| زەیتی کونجی | | ١٩٣-١٨٧ | ١١٦-١٠٤ | ٨ | ٤ | ٤٥ | ٤١ |
| زەیتی گەنمەشام | | ١٩٦-١٩١ | ١٣٠-١١٦ | ١١-٧ | ٤-٣ | ٤٩-٤٣ | ٤٢-٣٤ |
| زەیتی گوڵەبەڕۆژە | | ١٩٢-١٩٠ | ١٣٦-١٢٢ | ١٠ | ١٣ | ٣٩-٢١ | ١ صفر |
| ٢. ڕۆنی ئاژەڵی<br>ڕۆنی مەڕ و بزن و مانگا | | ٢٣٥-٢١٦ | ٤٠-٢٦ | ٢٦-٢٣ | ٣-١٠ | ٤٠-٣٠ | ٥-٤ |
| ڕۆنی پیو و دونگ | | ١٩٥-١٩٠ | ٧٠-٤٦ | ٢٦-٢٢ | ١٧-١٠ | ٥٥-٤٥ | ١٠-٨ |
| ڕۆنی ماسی | | ١٩٥-١٨٥ | ١٩٠-١٢٠ | ١٦-١٠ | ٢-١ | - | - |

٢ . نەتیری هەندێك لە رۆنەکانو زەیتەکان .

هەموو رۆنێك یان زەیتێك بە هۆی ئاوو بەیاریدەدانی کەمێك لە ترشی نائەندامی[٦] شی بۆ گلیسرینو ترشەکان ناوی.

وێنە ـ ١٨ هاوکێشەی ئەم جۆرە شی بوونەوەیە نیشان ئەدات :

$$\begin{matrix} R-COOCH_2 \\ | \\ R'-COOCH \\ | \\ R''-COOCH_2 \end{matrix} + 3H_2O \xrightarrow[\text{یان ئەنزیم}]{H^+} \begin{matrix} RCOOH \\ + \\ R'COOH \\ + \\ R''COOH \end{matrix} + \begin{matrix} CH_2OH \\ | \\ CHOH \\ | \\ CH_2OH \end{matrix}$$

وێنە - 18

شیاوی باسە شیبوونەوەی رۆن لەناو خانەکانی رووەك و گیانلەبەر بەیارمەتی ماددەی (ئەنزیم[١٤] Emqyme) جێبەجێ دەبێت .

هێزی ترشە ئەندامییەکان بە کارلێکردنیان لەگەڵ تفتێکی[١٥] ناسراودا وەکوو هایدرۆکسیدی سۆدیوم ئەدۆزرێتەوە . واتە بە هۆی دۆزینەوەی (ژمارەی سابوون) ترشەکان دەناسرێن .

بێ گومان رۆنی شل واتە (زەیت) بە کارلێکی (هایدرۆجینین)[١٦] بەندە جووتەکانی تێر دەکرێنو شێوەی زەیتەکە دەگۆڕێتو رەق دەبێت

## تێکچوونی رۆن[١٧] .

بێ گومان هەموو ئەیزانین رۆنی کۆن تام بۆنێکی ناخۆشی هەیە بەڵکوو تامیشی تاڵ دەبێت ودەگۆڕێت . مەسەلەی تێکچوونی سروشتی رۆن گیروگرفتێکی باوەو گەلێك لە تووژینەرەکان لێکۆڵینەوەیان دەربارەی کردووە . نووسەری ئەم وتارەش ژمارەیەك لێکۆڵینەوەی دەربارەی (مرن بوونی) رۆن بڵاوکردۆتەوە[١٨] . هۆیەکانی تێکچوونی تام و بۆنی رۆن لەم خاڵەی خوارەوە کۆدەکرێتەوە :ـ

١ . کارلێکردنی ئۆکسجینی هەوا لەگەڵ بەندە جووتەکانی رۆنو پێکهێنانی پیرۆکسیدی رۆنەکان .

شیاوی باسە ئۆکسجین یەکەم جار لەگەڵ ئەو کاربۆنەی تەنیشت بەندە جووتەکە کارلێك دەکات (سەیری وێنە ـ ١٩) بکە :

```
CH2O-COCH=CH -CH2-R
 |
 CH-OCO-CH=CH- CH2-R      +   O2   ------->
 /
CH2-O-CO-CH = CH- CH2-R

                                  R*OO
                              CH2-OOOCH=CH-C-R
                O-OH           |
             R -C= CO CO  -CH2
                               |
                              CH2-O-CO-CH = C-CH-R
                                               |
                                            HO-O
```

وێنە - 19

پیرۆکسیدەکان لە پاشان شیدەبنەوەو لە ئەنجامدا ژمارەیەکی زۆر لە جۆرەها ئەلدەهایدوکیتۆن[١٩] بەرهەڵا دەبن . بۆنی ئەلدەهایدو کیتۆنەکان وتامیان زۆر ناخۆشەو تامو بۆنی رۆنەکە دەگۆڕن .

٢ . هەندێك جار ئامادەبوونی قەبارەیەکی کەم لە تایۆنەکانی ئاسن یانمس یان میرنالەکانتر[٢٠] هانی رۆن ئەدەن بۆ ئۆکسیدینو لە پاشان رۆنەکە تێکدەچێت .

٣ . هەندێك لە زاناکان دەڵێن : تێکچوونی رۆنو خراب بوونی تامو بۆنی بەهۆی کارایکی ئەنزیمی تایبەتی جێبەجێ دەبێت .

## بەربەستکردنی تێکچوونی رۆن

زۆربەی رۆنەکانو زەیتەکان لە تێکچوون دەپارێزرێن بە هۆی تێکەڵ کردنی رۆنەکە لەگەڵ رێژەیەکی کەم لە ماددەی کیمیایی تایبەتی کە ناسراون بە (دژ ئۆکسیدین (Anti Oxidant)[٢١] نموونەی ئەم مادە دژئۆکسیدینانە فینۆلە وناوریەکانی فینۆل ، هەروەها چەن ڤیتامینێکیش هەن کە دژی ئۆکسیدینن وەکوو ڤیتامین ـ E وڤیتامین ـ C .

میکانیسمی[٢٢] کارلێککردنی مادەکانی دژ بە ئۆکسیدین بریتییە لە کارلێکردنی ماددەکە لە گەڵ رەگی بەرەڵا[٢٣] وەکوو لە هاوکێشەی خوارەوە[٢٤] نیشان ئەدەین (وێنە ـ ٢٠)




وێنە - 20

## لەخۆوە سوتانی رۆنی نەتێر لەپڕ[٢٥]

ئەم دیاردەیە هەندێك جار روو ئەداتو رۆنی (نەتێر) واتە زەیتی شل ئەگەر هاتوو بکەوێتە سەر پەرۆیەکی کۆنو لە شوێنێکی بەتاك دانرا ، ئەوا لەوانەیە لەپڕ ئاگر بگرێت لە خۆیەوەو بسوتێت .

بێگومان ئەم دیاردەیە هەندێك جار بووەتە هۆی سووتانی گەلێك لە ماڵو سامان بەبۆنەی بێ ئەرخەمیو نەزانین . چۆن رۆنەکە لەخۆیەوە ئاگر دەگرێت؟؟ بەڵێ !! بەندە جووتەکانی نێوان کاربۆنوکاربۆن واتە $C=C$ لەگەڵ ئۆکسجینی هەوادا کارلێکی کیمیایی دەکەن وئۆکسیدین دەکەن . ئەم جۆرە کارلێکە گەرمییەکی زۆر بەرەڵادەکاتو لەناو پەرۆکە دەمێنێتەوە کۆمەڵ دەبێت هەتا دەگاتە رادەیەك دەسوتێت وگڕ دەگرێت .

## ژمارەی ئەسیتیل[٢٦]

ژمارەی ئەسیتیل بریتییە لە ژمارەی ئەو میللغرامانەی هایدروکسیدی پوتاسیوم (KOH) پێویستە بۆ کارلێك کردن لەگەڵ ترشی سرکەی بەرەڵابوو لە غرامێك رۆن ئەسیتیلێن کراو واتە Acetylated[٢٧].

## گوازتنەوەی ئیستەر[٢٨]

کارلێکی گوازتنەوەی ئیستەر لە کیمیای ئەندامیدا ناسراوەو بەهۆیەوە سروشتی ئیستەر دەگۆڕێت بۆ ئیستەرێکی نوێ. رۆنیش وەکوو گوێمان (ئیستەرە)و ئەتوانین پێکهاتوەکەی بگۆڕین بەم کارلێکە واتەبە (گوازتنەوەی ئیستەر). کارلێکی گوازتنەوەی ئیستەر پێویستە دەبێ پێ ئاو بکرێت، هەروەها پێویستی بە تفتێکی گونجاوهەیەو وەکوو مێثۆکسیدی سۆدیۆم (سەیری وێنە - ٢١ لەخوارەوەبکە)



وێنە - 21

## پیشەسازی کردنی رۆن[٢٩]

رۆنی رووەکی واتە (زەیت) پێویستە گۆڕانکاریەکی زۆری بەسەردا بکرێت پێش ئەوەی بۆ خواردنی مرۆڤ دەسرێدات. ئەم گۆڕانکاریانە پێی دەڵێن (پیشەسازی کردنی رۆن) و لە راستیدا بریتیە لە پوختە کردنی رۆنەکەچونکە رۆنەکە خۆی لە لایەن رووەکەوە دروست دەکرێت بەلام بۆن و تامی خۆش نیەو پێویستی بە پوختە کردن هەیە.

لە عیراق یەکەم رۆنی خواردن لە (زەیتی دارخورما) دروست دەکرێت زەیتی دارخورماش هەروەکوو گوێمان لە هەندیك وڵاتی ئەفەریقی وئاسیایی وەکوو مالیزیا بەکار دەهێنرێت. کومپانیای (زیوت) رووەکی لە بەغداو لە شوێنی تر دەیپاڵێون و پوختەی دەکەن. قۆناغەکانی پوختەکردنی رۆنی دارخورما بەکورتی لە خوارەوە باسی دەکەین:

١) قۆناغی یەکەم:

———————:- رزگار کردنی زەیتەکە لە ماددەی موم :

زەیتە هەرلە رێگاوە دێت بەتاڵی دەکەنە ناو تانکیەکی بار بلندو بەرزو لەناو ئەو تانکیە دەمێنێتەوە بۆ دووسێ حەفتە بۆ ئەوەی خلتو مێوەکەی ناوی بنیشێت و بچێتە خوارەوە.

٢) قۆناغی دووەم

———————:- رزگار کردنی زەیتەکە لە بۆنی ناخۆش: بۆنە ناخۆشەکانی رۆن بریتین لە چەن ئەلدهایدێك و کیتۆنێکی سووك. بەهۆی رەتکردنی بوخارێکی گەرمی ئاو هەموو ئەو ئەلدهایدو کیتۆنانە دەبنە هەڵم و رۆنەکە بەجێ دەهێڵن.

٣) قۆناغی سێیەم

———————:- گرتنەوەی کاروتین: [٣٠] ماددەی کاروتین ماددەیەکی زەردە بەلام لەبەر ئەوەی قەبارەکەی یەگجار لەناو زەیتەکە زۆرە رەنگی زەیتەکە رەشە وەکوو دۆشاو. بە هۆی کارلێکی کیمیایی و توێنەری گونجاو کاروتینەکان لە رۆنەکە جیا دەکرێنەوە. کاروتینەکان بەکار دەهێنرێن لە قۆناغێکی دوایی بۆ رەنگ کردنی رۆنەکان.

٤) قۆناغی هایدرۆجینین

———————:- ئەم قۆناغە زۆر قۆناغێکی گرنگەو رۆنە شلەکان لێرەدا شێوەیان دەگۆڕێنە رۆنی توندو رەق. لێرەدا هەروەکوو گوێمان هایدرۆجین رەت دەکرێتە ناو زەیتە گەرمەکەو بە ئامادە بوونی توخمی نیکل یان پەلادیۆم یان توخمی میرتالی تر - بەم جۆرە هایدرۆجین کارلێك دەکاتە سەر بەندە جووتەکانی کاربۆن - کاربۆن ($C=C$) و هەموویان بە هایدرۆجین تێر دەکرێن. بەم جۆرە باری زەیتەشلەکە دەگۆڕێتە بارێکی رەق.

قۆناغی چوارەم.

———————:- تێکەڵ کردنی بۆن و رەنگ: لەم قۆناغەدا ئەبارێکی کەمی دیاریکراو لە کاروتینەکان دەکرێتە ناو هەندێك لە رۆنەکان و ناوی دەنرێت بە رۆنی (راعی).

جاران رۆنی (زەبەب)[٣١] هەبوو لە بازار بۆنو تامی رۆنی کوردی ئاژەڵی ئەدا. ئەو بۆنە لە راستیدا بۆنێکی دەستکردەو بریتیە لە ماددەیەکی کیمیایی تێکەڵ دەکرێت لەگەڵ هەمان رۆنەکونەکەی پاکژکراو.

شیان باسە لەم قۆناغەدا قەبارەیەکی دیاریکراو لە ماددەی (دژبە ئۆکسیدێن) تێکەڵ بە رۆنەکان دەکرێن ئەگەر هاتوو رۆنەکان عەمارکران بۆ ماوەیەکی زۆر.


### الدهون النباتية والحيوانية وصناعتها

الدكتور ذنون محمد پير يادي
/ كلية العلوم جامعة بغداد

خلاصة البحث

يتناول البحث التركيب الكيمياني للدهون الغذائية بنوعيها النباتية والحيوانية كمايشتمل البحث على بعض التفاعلات الخاصة بالدهون. كذلك طرق تصنيعها في شركة الزيوت النباتية وكيفية تحويل الزيوت النباتية الى دهونات جامدة بالمدرجة كذلك يتناول البحث اهمية عدم التشبع في تركيب الحوامض الشحمية من حيث الصحة العامة. كذلك دور الكولسترول الموجود مع الدهونات الحيوانية في الصحة العامة.

وفي نهاية البحث نبذة مختصرة عن مراحل تصنيع (زيت النخيل) المستورد وكيفية تحويله الى دهونات وزيوت صالحة للطعام.

## سەرچاوەو پەراوێزەکان

١. چیڤەرۆیل Michael Eugene Chevreul (١٧٨٦-١٨٨٩): پرۆفیسۆری کیمیا بوو لە پاریس. فەرەنسا، یەکەم زانا بوو کە لێکۆڵینەوەی کرد بە سەر شی کردنەوەی بەرهەمە سروشتییەکاندا. لە ساڵی (١٨١١) شی کردنەوەی رۆن بە یارمەتی هایدرۆکسیدی سودیۆم ئەنجام دا و بەم جۆرە (سابوون) ئامادە کرد Saponification هەروەها ترشەکانی خوارەوەی لە شی کردنەوەی رۆن ئامادە کرد:

- ترشی کاپریك و کاپرۆیك Capric and Caproic Acids
- ترشی پالمیتیك Palmitic Acid
- ترشی ستیاریك Stearic Acid
- ترشی ئۆلیك Oleic Acid

هەروەها چیڤەرۆیل لە ساڵی (١٨٣٤) ماددەی کریاتینی لە مێز جیاکردەوە، چیڤەرۆیل زانایەکی بلیمەل کاتی خۆی بوو لە تەمەنی (١٠٢) ساڵی دا کۆچی دوایی کرد.

٢. ئیستەر Ester ئەو ئاوێتەیەیە کە پێك دێت لە کارلێکی کیمیایی نێوان کحول و ترشی کاربۆکسیلی وەکو لە هاوکێشەی خوارەوە نیشان ئەدەین:

$$RCOOH + \bar{R}OH \rightleftharpoons RCOO\acute{R} + H_2O$$

٣. راعی: رۆن کومپانیای زیوت نباتیەی عیراقەو لە رۆن رووەکی دروست دەکرێت بە هایدرۆجینی زەیتی دارخورما (زیت النخیل Palm oil)

٤. گوشار = ضغط

٥. توێنەر = مذیب Solvent

٦. ترشی چەوری = الحامض الشحمی = Fatty acid

٧. ترشی تێر = الحوامض المشبعة واتە ئەو ترشانەی کە بەندی جووتیان وەك $C=C$ یان $C\equiv C$ نییە

٨. ترشی نەتێر = الحوامض غیر المشبعة: ئەو ترشە ئەندامیانەن کە بەندی جووتیان تیادا هەیە.

٩. ژمارەی سابوون = عدد التصوبن = Saponifi Cation Number بریتیە لە ژمارەی ملیگرامی هایدرۆکسیدی پوتاسیۆم کە پێویستە بۆ گۆڕینی غرامێك لە رۆن بۆ سابوونی پوتاسیۆم.

١٠. ژمارەی یۆدی/العدد الیودی Iodine Number بریتیە لە ژمارەی گرامەکانی یۆد کە کارلێکی کیمیایی لەگەڵ (١٠٠) گرام لە رۆنەکە دەکات.

١١. رۆن دارخورما = زیت النخیل: ئەم زەیتە لە دارێکی تایبەتی پوخته دەکرێت بە ناوی دارخورما بەڵام خورما ناگرێت زەیتەکە وەکو دۆشاوی رەش وایە، بۆنێکی ناخۆشی هەیە هەروەها تامیشی ناخۆشە. بەڵام کارگەی دروستکردنی رۆن لە بەغدا ئەم رۆنە کە لە مالیزیاو ئەفریقیا دەکڕن و پوختەی دەکەن و گەلێك جۆرو چەشنی لێ دروست دەکەن وەکو رۆنی راعی و رۆن نەرگز و یاسمین و زەینەب و زەیتی کچ واتە (زیت البنت).

١٢. رۆن ماسی ئاژەڵی نییە بەڵکو رۆن گیانەوەری واتە رۆن حەیوانییە.

١٣. ترشی نائەندامی = حامض لاعضوی. وەکو ترشی گوگردین یان هایدرۆکلۆریك.. هتد.

١٤. ئەنزیم = بریتیە لە ماددەی پرۆتینی و جۆرها چەشنی و بایەخی هەیە لە ناو خانەکانو شانەکاندا. ئەنزیم ئەتوانێت گەلێك کارلێکی کیمیایی ئاسان بکات و هەر ئەنزیمێك تایبەتە بە کارلێکێکی کیمیایی دیاری کراو.

١٥. نفت = قاعدە Base

١٦. هایدرۆجینین = المدرجه Hydrogenation. کارلێکی کیمیایی غازی هایدرۆجین لەگەڵ ئاوێتەی گونجاو وەکو (زەیتی شل) پێی دەڵێن هایدرۆجینین. ئەم کارلێکە پێویستی بە کەمێك لە بۆدرەی نیکل یان پەلادیوم هەیە.

١٧. بە ئینگلیزی تێکچوونی رۆن و خراپبوونی تام و بۆنی بەهۆی کۆن بوونی رۆنەکە یان بە بۆنەی گەرمی شوێنی عەمبارکردن و بارودۆخی هەوای زۆری عەنبارەکە پێی دەڵێن Rancidity بە زوبانی عەرەبیش پێی دەڵێن (تزنخ الدهن) او زناخة الدهن واتە ئەتوانین بە کوردیش پێی بڵێین (رۆن دڕناری)] چونکە بۆنی دڕنی لێ دێت.

١٨. ئەم لێکۆڵینەوانەم دەربارەی تێکچوونی رۆن بڵاوکردۆتەوە:

1— PYRIADI, T M. and MASON, Composition and Stability of Pecan Oils, J. Am. Oil Chem. Soc. 45, 437 (1968)

2— PYRIADI, T. M., and N. Na3 hat, Effect of Some Antioxidants | Synengists on the Stabiliz- ation of Common Ly used Edible Oils and Fats Processed Iraq. IRAQi J. sci, 21. (2). 319 (1980).

3— PYRIADI, T. M.M. A Clhawani, and N. Y. Naz hat. Correlation of stablities of Locally Processre Edible Fats and Oils in Iraq With their Structures, J. Iragi Chem. Sori, 2,23 (1977)—





4- -PYRIADI, T. M. and N. NaJhat
Retardation of Rancidity in some Edible Fats
and oile Processed in Iraq., Iraq J. Sci. 26, ..
(1985).

١٩ . ئەلدەهاید وەکوو R-C-H کیتۆن وەکوو R-C-R

٢٠ . میز تال = فلز Metal

٢١ . مضادات الاكسدة .

٢٢ . میکانسم Mechamism واتە میکانیکیە واتە قوناغەکان کارلێکی کیمیایی بە دریژی و بە قوول .

٢٣ . رەگی بەرەڵا = جذرحر = FREE RADical وەکوو : $C_2H^{\bullet}$ , $CH_3^{\bullet}$, $Cl^{\bullet}$, $H^{\bullet}$ .. هتد

٢٤ . هاوکێشە = معادلە .

٢٥ . لە خۆوە سووتان لەپر Spontaneous Conbustion یان (الاشتعال الفجائی الذاتی) .

٢٦ . ژمارەی ئەسیتیل Acetyl Value
ئەسیتیل بریتییە لە کۆمەڵەی $(CH_3\text{-}C\text{-})$

٢٧ . رۆنی ئەسیتیلێن کراو - بریتیە لەو رۆنەی کە کارلێکی کیمیایی لەگەڵ (ئەنهیدریدی ترشی سرکەدا) کردوە . لەم کارلێکە لەراستیدا کۆمەڵە کانی هایدرۆکسیل (OH) دەبکاتو دەگۆرێنی $(\text{-O-C-}CH_3)$ واتە ئەسیتیلێن دەکرێن چونکە کۆمەڵەی $(\text{-C-}CH_3)$ دەچێتە ناو رۆنەکە لەپاشان رۆنەکە بە کارلێکی کیمیایی لەگەڵ ئاوی ترشدا کۆمەڵەی $(\text{-C-}CH_3)$ بەرەڵا دەکات بە شێوەی ترشی سرکە . ترشە (سرکەکە) دەپێورێت بە هۆی کارلێک کردنی لەگەڵ شلاوی هایدرۆکسیدی سۆدیۆم .

٢٨ . Transesteri fi Cation = انتقال الاستر .

٢٩ . پیشەسازی کردن = تصنیع .

٣٠ . مۆم = شمع .

٣١ . کارۆتین = مادەیەکی سروشتی رووەکییەو رەنگێکی زەرد یان مەیلەو سووری هەیە . کارورەوشتی زۆر لە ڤیتامین - A دەچێت .

٣٢ . بۆنی رۆن - لە کومپانیای زیوتی رووەکی بەغدا ماددەکە لە ژاپۆن دەکرێتو فەبارەیەکی زۆر زۆر کەمی پێویستە بۆ گۆرینی بۆنی رۆنەکە .

٣٣ . رۆنی (زەینەب) و یاسمین و زوبیدەوراعی وزەیتی کچ واتە (زەیت البنت) هەموو لەزەیتی دارخورمادروست دەکرێن .



# کشتوکاڵ لە عیراقی کۆندا



**تێبینی :**

جەز دەکەم خوێنەری بەرێز لەوە باخەبەربێ کە ئەم بامە وەك بەشێك لە پێداویست و مەرجی دەرچوون پێشکەشی بەشی ئارکیۆلۆژی کۆلێجی ئەدەبیاتی دانشگای بەغداکراوە .

## ● پێشەکی ●

لە چاخە هەرە دێرینەکانەوە ئادەمیزاد لە ئەشکەوتی شاخەکانی باکوورو باکووری رۆژهەلاتی ئەو شوێنەدا ژیاوە کە بەعیراق دەناسرێ.

ئەمەش بەو پاشماوەو شوێنەوارانەوە دیارە کەلەو ئەشکەوتانەدا بەجێی هێشتوون و برێکی دی باسیان دەکەین، وەك ئاشکرایشە هەموو پێداویستی و ئامرازەکانی ژیانی رۆژانەی لەوان سەردەمانەدا لەبەرد دروست دەکرد؛ هەر لەبەر ئەوەیشە بەو چاخانە گوتراوە چاخە بەردینەکان.[1]

جا بۆ ئەوەی لەبارو دۆخی سرووشتی و ئاووهەوایی ئەم چاخانە بزانین کە ئادەمیزادی تیا ژیاوەو کاریگی زۆری بە هەڵوکەوتی گشتی یەوە هەبووە دەبێ ئەوە بزانین کە :-

گۆی زەوی بەچەند جوولانەوەیەکی جیۆلۆجی تێپەڕیوە، دوا جوولانەوەیشی ئەوەبووە، کە بە (هیلیۆسین) ناسراوەو لە چاخی جیۆلۆجی نوێدا بووەو دەکاتە بیست هەزار ساڵ بەر لەئێستا.

بەڵام دەورانێکی جیۆلۆجی گرینگ بەر لەم دەورانە هەبووەو بە (پلایستۆسین) ناسراوە؛ لەم دەورانەدا چیا نوێیە پێچاو پێچەکان پێك هاتوون و گۆرانکاریەکی زۆر لە ئاووهەوادا بووە؛ کە لەئەنجام دا چوار بارستی شەختەبەندی تێدا خشیوەو بەشەکانی باکووری گۆیی زەوی داگرتووە، بەتایبەتیش شوێنە بڵندەکانی . . .

لە نێوان هەردوو شەختەبەندیش (ماوە)یەکی تا رادەیەك گەرموکەی بەخۆیەوە دیوە.[2]

لە دەورانی پلایستۆسین دا، چەند کۆمەڵێکی ئادەمی و نیمچە ئادەمی دەرکەوتن، لەوانەیش ئەو کۆمەڵەی کە بە (ئادەمزادی مەیموونی ی پشت راست) ناسراوەو کۆمەڵەی ئادەمزادی نیاندرتال و ئینجا کۆمەڵەی (ئادەمزادی ژیر)، کە بە دەرکەوتنی، کۆمەڵەکانی دی ون بوون و نەمان ئینجا ئەم کۆمەڵەیە (واتە ئادەمزادی ژیر) دەستی بەسەر گۆی زەوی داگرت. مرۆڤی خالی حازریش هەر لەو کۆمەڵەیە کەوتووەتەوەو لقی لێ بووەتەوە.

ژیانی ئادەمیزاد بەم جۆرە هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانی یەوە تاکو بە چاخە مێژوویی یەکان گەیشتووە، بەچەند خول و قوناخێکی شارستانی دا تێپەڕیوە کە بە چاخە بەردینی یەکان ناسراون، چونکە ئەو ئامرازانەی بەکاری هێناوە لەبەرد دروست کراون.

لێ تۆژەکان ئەم چاخانەیان لە عێراق دا بەهۆی جیاوازی و پەرەسەندنی پیشەسازی بەردی و ئامرازە تیقانیەکان بەسەر چەند قۆناخێك دابەش کردووە کە ئەمانەن :-[3]

**● چاخی بەردینی دێرین - (Palaeolithic)[1]**

لەم ماوەیەدا ژیانی ئادەمیزاد زیاتر بەراوو کۆکردنەوەی بژێوییەوە بەند بوو، بەڵکەش ئەوکۆمەڵە ئامرازانەن کەلە

(بەردەبەڵکە)ی نزیکی چەمچەماڵی ئێستا (لە کوردستانی عێراق) دۆزراونەتەوەو بەنزیکەی (١٠٠٠٠٠) سەدهەزار ساڵ بەرلەئێستا دیاری کراون،[٥] هەروەها ئەشکەوتی (هەزارمێرد) لە دەوروبەری شاری سلێمانی و (چینی - D) لە ئەشکەوتی شانەدەر لەناوچەی هەولێر.

● چاخی بەردینی نێوەڕاست (MesoLithic)[٦]

ماوەی ئەم چەرخە دواداوکانی دەورانی پلایستۆسین دەگرێتە خۆ بەهۆی پاشماوە وردەکانیشیەوە بە چاخی (مایکرۆلیثیکیش - MicroLithic) ناسراوە چونکە ئەو ئامرازانەی ئادەمیزاد لەو سەردەمەدا لە بەردو ئێسقان دروستی کردوون پێشکەوتنێکی ئاشکرای پێوە دیارە لە ڕووی لێ خەوتان و بایەخ پێ دانەوە کە نموونەیان لە مۆزەخانەکانی دنیادا پارێزراوە، بەتایبەتی مۆزەخانەی عیراقی لە بەغدا.

ئەم چەرخە لە عێراق دا بەهۆی ئەشکەوتی (زرزی)یەوە بە چەرخی زرزی ناسراوەو واری تەکاندانی ئادەمیزادیشە بەرەو ماوەو سەردەمێکی گرینگ لە ژیانی دا کەوا کاکڵی باسەکەمانە ئەویش چەرخی بەردینی نوێیە.

● چەرخی بەردینی نوێ - NeoLithic

یا - سەرەتای شۆڕشێکی نەبڕاوە

لە ژیانی ئادەمیزاددا -

چەرخی بەردینی نوێ بەچاخی بەرهەم هێنانی بژێوی (Producing Food) یش ناسراوە، سەبارەت بەوەی بەرهەم هێنانی بژێوی بەکشت وکاڵ و ماڵی کردنی ئاژەڵەوە دوو ڕووداوی گرینگ بوون هاتنە نێو ژیانی ئادەمیزادو ئادگاری شارستانیەتیان پێوەبێ؛ بەڕادەی ئەوەی زۆر لە مێژوونوس و ئارکیۆلۆژیستەکان بایەخی ئەم پێشکەوتنە بەبایەخی شۆڕشی پیشەسازی شارستانیەتی نوێوە دەگرن.

بەرهەم هێنانی بژێوی بەکشت وکاڵ و ماڵی کردنی ئاژەڵیش هۆی لە ڕادەبەدەر پڕبایەخ بوون ئادەمیزادیان لە ژیانی کیوبابەتی و چۆڵپەرستی چاخەکانی بەردینی کۆن بۆ ژیانێکی پێشکەوتوو گواستەوە. ڕاستیش نەوەکانی ئاخرو ئۆخری چاخی بەردینی نێوەڕاست زەمینەی ئەو شۆڕشە ئابووریەیان خۆش کرد.[٧]

بەلام داخۆ کامەیان لەپێشدا بوو، ماڵی کردنی کشت وکاڵ یان ئاژەڵ؟

هەندێ لە لێ توێژەکان دۆزینەوەی کشت وکاڵ دەخەنەپێش ماڵی کردنی ئاژەڵ؛ ئەوانە وای دەبینن کە «هەوڵی ماڵی کردنی زۆربەی ئەو گیانلەبەرانەی کە ئێستا هەن لەپێش بەرهەم هێنان دا سەرنەکەوتووە سەگ نەبێ(!)، چونکە سەگ هەر لە چاخی بەردینی نێوەڕاستەوە ماڵی کرابوو».[٨] ئەمەیش هەروەك ئاشکرایە دەگەڕێتەوە بۆ بەرژەوەندی و پەیوەندی نێوان سەگ و ئادەمیزاد؛ سەگ بەهۆی بەرهەستیی تەواوی لە بۆن کردن و گوێ قوڵاخی دا توانیویەتی بەدوای نێچیر بکەوێ، لەهەمان کاتیشدا لەهەموو مەترسی یەك ئاگاداری خاوەنەکەی بکاتەوە، خاوەنەکەیشی لە پاداشتی ئەوەدا پاشماوەی نێچیرەکەی بداتێ.

مێژووی ماڵی کردنی ئاژەڵیش (لەتەواوی دنیادا) وەختێکی زۆری ویستووە، بەپێچەوانەی ئەو ڕووەك و دانەوێڵانەی ئادەمیزاد ڕواندوونی.

بۆ گۆڕانکاری ئابووریش کە بەهۆی بەرووبوومی کشت وکاڵی یەوە بووە بەتایبەتیش دانەوێڵە، «ئەوە دوای ئەوەی وشکی ڕۆژهەڵاتی نزیکی داگرت، چەند جۆرێك گەنم و جۆی خۆڕسك لەو ناوچەیەدا شین بوون، لەو کاتەدا ئادەمیزاد ناچار بوو لەپێناوی مانەوەیدا بژێوی خۆی بەرهەم بهێنێ، بۆیە بەرەبەرە بەرزاییەکانی بەجێ هێشت و ڕووی لەمێرگە بەرئاوەکان کرد».[٩]

بەم جەشنە توانی بەرووبوومی وەك دانەوێڵە بڕوێنێ و مێگەلەکانی وەناوبێنێ، دوای ئەوەی بەکۆکردنەوەیان ژیانی بەسەر نەدەبرد.

لە جێگیربوون و دروست کردنی مەزڵی جێگیربوونیش دا، کۆڵیتەکانیان لە قوڕی پەتی دروست کردو بەقەدی درەختانیش دارە ڕێیان دەکردو پاشان قوڕەبەست دەکرا. بەم جەشنە سەقامیان گرت، ئیتر دەستیان دایە چاندنی بەرووبووم خواردن و ماڵی کردنی ئاژەڵ بەمەیش ژمارەی دانیشتوان زیاتر بوو کە لەدواییشدا بوو بە هۆی نەش ونمای کۆمەڵگای گوندنشین، لەئەنجامی یەکگرتنی

کۆمەڵە خێزانێك لەپێناوی بەرهەمهێنانی بژێوی و داکۆکی لە خۆیان. زۆر بوونی بەروبووم و خۆراکیش جۆرە تایبەتمەندییەکی پێك هێنا، وەکو دیاردەیەکیش دەسەرەنجامێکی پڕ بایەخی بۆژیانی لەوە بەدوای ئادەمیزادی لێکەوتەوە، چ لەوەی پێوەندی بە پەرەسەندنی هونەرەوەبێ، یا بە گەشەکردنی چینێکی کۆمەڵایەتی کەوا کاری ئارەزووە ئاینییەکانی ئادەمیزادی بەخۆ سپارد. [10] ئەمەش هەمووی بەهۆی ئەو شێوازە نوێیە بوو کە خۆی لەوەرزی کشت وکاڵ هێنابوویە کایێ.

لە ڕوانگەی ئارکیۆلۆژیشەوە، لێتوێژەکانی بەرایی ئەم چاخەیان بە پیشەسازی گڵێنە (pottery) لەچاخە بەردینییەکانی دی جیاکردۆتەوە؛ تا ئەوەی گڵێنە بوو بەهۆی جیاکردنەوەو ناسینەوەی هەوارنشینەکانی چاخی بەردینی نوێ خۆیشی . . .

ئەمەش لەپاڵ پاشماوەی کشت و کاڵی و ئاژەڵ دا، وەك پاشماوەی ئەو دانەوێڵانەی ئادەمیزاد چاندوونی (گەنم وجۆ)، هەروەها ئێسك و پروسکی گیانلەبەرە ماڵی کراوەکان و ئەو ئامرازانەی لە تیشەی بەرد دروستیان دەکردو لە کشت وکاڵ دا بەکاریان دەهێنا.

بەڵام لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە: داخۆ ئەو بەرەو پێش چوون و پەرەسەندنە لەیەك کاتدا و لە گشت دنیادا وەکو یەك بووە؟ یان چۆن؟

تەواوی لێتوێژ و ئارکیۆلۆژیستەکان (بەشێوەیەکی گشتی) لەو باوەڕەدان کە سەرەتاکانی شۆڕشی کشت وکاڵی لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی نزیك دا بووە، بەدیاریکردنیش بناری چیاکانی باکووری عێراق و زنجیرە چیای زاگرۆس و بانەکانی ئاسیای ناوەڕاست. . ئەمەیش بەگەلێك بەڵگە چەسپاوە؛ لەوانە بوونی ڕەگەزی هەندێ ڕووەکی کێوی بەتایبەتیش دانەوێڵە کە ئادەمیزاد بەچاندن ماڵی کردوون وەکو گەنم و جۆ، هەروەها بنەچەی چەند گیانلەبەرێکی کێوی ماڵی کراو وەکو مەڕ و بزن و مانگا. بێجگە لەو ئامرازانەی لە کشت و کاڵ بەکاری هێناون و لە هەندێ شوێنەواردا دۆزراونەتەوە وەکو داسی بەردینی دەسك دار و گاسنی بەردو جۆنی و دەستار و چەقۆی بەردی، جگە لە ئامرازی وەك دەرزی و کەوچك و سوژنی بەردین،

تەنانەت هەندێ خشڵی بەردینیش کە لە بەردی مەڕمەڕیان دروست کردبوون، سەرەڕای پەیکەری ئاژەڵە ماڵی کراوەکان، هەروەها پەیکەری خوداوەندی دایك (خوداوەندی بەپیتی) کە پەرستوویانەو پێوەندی بەو قۆناخەوە هەبووە وەکو نیشانەی بەپیتی . . . [11]

● هەوارە کشت وکاڵییەکانی بەرایی:

ئەو شۆڕشە کشت وکاڵییەی باکووری عێراق بەخۆیەوەدی پێشهاتێکی لەناکاو نەبوو، بەڵکو بەقۆناخ بوو و هەر ئاوەهایش پەرەی سەند.

سەرەتا گوندە کشت وکاڵییەکان بچووك بوون، لە چەند ماڵۆکەیەك تێنەدەپەڕین، پاشان وای لێهات فراوانتر بوون بەرەوپێشتر چوون، بەرادەی ئەوەی چەشنێك لە دابەش بوونی کاریش لەو کۆمەڵگا کشت وکاڵییانە پێك هات؛ ژن لەو کۆمەڵگایانەدا سەرەڕای بەخێوکردنی منداڵ دانەوێڵەشیان دەهاڕی و نان و خۆراکیشیان ئامادەدەکردو تەونیان دەکردو ماڵاتیشیان پەروەردە دەکرد، پیاویش چەك و ئامرازی دیکە لەبەرد دروست دەکردن و کێڵگەی وەنارەدەهێنا و دەیپاراست و دەچووە ڕاوێ. [12]

کشت وکاڵ لە هەوارگەکانی بەراییدا دێمی کراو بوو، لە ڕووپێوێکی بچووك دا دەکرا کەبەشی خێزانێك بکا، دیسان تا دوادواکانی ئەم چەرخەیش درەختی بەرداریان لە کێڵگەدا نەدەڕواند بۆیە وای دەچێ کشت وکاڵیان بەراگواستن بووبێ؛ بەوەی کە خاکەکە تینی تێدا نەما دەیانگواستەوە زەوییەکی تری بەپیت.

پەیدابوونی مڵکایەتی تاکە کەسیش هەر لەو سەردەمەدا بوو، کە بریتی بوو لە مڵکایەتی کێڵگە ئامرازە سەرەتاییەکانی بەرهەم هێنان و گیانلەبەرە ماڵی کراوەکانی لەوەڕگە.

گرینگترینی ئەو هەوارە کشت وکاڵییانەش ئەمانەن:-

● چەرمۆ ●

ئاێستا ئەم گوندە کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی شاری چەمچەماڵ و ۳۵کم لە کەرکووك دوورە، بەکۆنترین گوندی کشت وکاڵی ناسراوە لە هەموو دنیادا. [13]

پاشماوەی (چەرمۆ) لەلایەن ئێرەدیەگی (پەیمانگای

ڕۆژهەڵات)ی سەر بەدانیشگای شیکاگۆی ئەمەریکایی بەوە (١٩٤٨ - ١٩٥٥) دۆزراوەتەوە پشکنینەکانی ئەم نێردە شازدە چین یا دەوری نیشتەجێبوونی بەدیارخستووە کە بە قوڕ دروست کراون.

بەهۆی بەکارهێنانی ڕێگای (کاربۆن ١٤ - C14)[١٤] چینی یەکەم بەنزیکەی ٦٧٥٠ ساڵ پ.ز دیاری کراوە.

(چەرمۆ) بەڵگەی یەکەمین گوندی هەمیشەیمان دەداتێ، شوێنەواری تا (٢٥) ساڵی لێ دۆزراوەتەوە، هەر ماڵێك چەند ژوورێکی بچووکی تێدایەو دیوارەکانیان بەقوڕ لەسەر بناغەیەکی بەردین دروست کراوەو ئاگردانیشی تێدا بووە، جگە لە هەندێ پەیکەرۆکەی قوڕی سوورەوەنەکراوی ئاژەڵان و خوداوەندی دایك (خوداوەندی بەپیتی)و گڵێنەی هەمەجۆر کە لەچینەکانی سەرەوەدا دۆزراوەتەوە.

• بەلانی کەمەوە دوو جۆرە گەنم لە چەرمۆدا چێنراون، ئەمەش لەو دەنکە بەخەڵووز بووانەدا دەردەکەوێ کەلێی دۆزراونەتەوە جۆرەکانیش (ئینکۆرن - Einkorn) و (ئیمیر - Emmer) ن، سەرەڕای جۆرێك بەزالیا.[١٥]

ئێمە بەهۆی ئەو خۆنی و دەستار و سەرەدوێژ ینگە قوڕی و بەردیانەوە دەزانین کە دانەوێڵەیان پێ هاڕیوە

● حەسوونە ●

هەوارگەیەکی دیکەی کشت وکاڵییە، دەکەوێتە سنووری شاری مووسڵ ٣٥کم بەلای باشووردا.

پەرەسەندنی شۆڕشی کشت وکاڵی لەحەسوونەدا ئاشکراتر و ڕوونترە. پشکنینە ئارکیۆلۆژییەکان تاکو دە نەوەیان لەو کۆمەڵگایەدا بەدەرخستووە کە پاشماوەکانیان لە شازدە چینی سەرەکیدا بووە.[١٦]

لەچینی یەکەمدا لەسەر ساغە (Virgin Soil) هەوارگەیەکی کشت وکاڵی دۆزراوەتەوە کە لەوە دەچێ دانیشتووانی لە چادردا ژیابن چونکە شوێنەواری خانووی قوڕ دەرنەکەوتووە، تەنیا کۆمەڵێك گڵێنەی چەرخی بەردینی نوێی تێدا دۆزراوەتەوە.[١٧]

● تەللوصیوان ●

ئەم هەوارگەیە دەکەوێتە کەناری لای ڕۆژهەلاتی ڕووباری دیجلە بە ١٠کم دوور لە باشووری سامەڕا.

(تەللوصیوان) شوێنەواری کۆمەڵێك گوندی کشت وکاڵی تیادەرکەوتووە بایەخی ئەم شوێنەوارە دوای لێکۆڵینەوەی ئەو پاشماوانە دەرکەوت کەتێیدا دیترانەوە.

● گوندی مه ئاره ●

دەکەوێتە باشووری شاری کەرکووك و وەختی خۆی لەساڵی ١٩٤٨دا لەلایەن نێردەیەکی دانیشگای شیکاگۆ پشکنراوە، پاشماوەکانیشی لەگەڵ پاشماوەکانی حەسوونە یێك دەچن.

هەروەها (ئوم ئەلدەبیاغییە) کە ٢٦کم لە ڕۆژئاوای شاری (حەزەر)ەوە دوورەو (نەینەوا)و (یارم تەپە - لەدەشتی شەنگار) (شمشارە - لە دەشتی ڕانیە؛ کە ناری لای دەستەڕاستی ڕووباری زابی بچووك)و (ئەربەچییە)و (برایم عەزۆ)و (چۆخەمامی) لە باکووری شاری مەندەلی و هی تر.

● بەشی یەکەم ●

<u>هۆیەکانی سەرهەڵدان</u>

ئەو خاڵانەی سەرنج ڕادەکێشن، ئەوەندەی پەیوەندی بە نیشتەجێ بوونی ئادەمیزادەوە هەبێ لە دەشتاییەکانی دۆڵی دووئاوان (ڕافیدێن)و پەیوەندی ئەوە بە ئاووهەواوە، بەڵگە بەردەستەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە جیاوازی لە ئاوو هەوای ئەو ناوچەیەدا، هەشت هەزار ساڵی پ.ز لەگەڵ ئێستادا ئەو جیاوازییە جەوهەرییە نییە چ لەبارەی بارینی بارانەوە بێ یا پلەی گەرمی.

ئەم خاڵەیش بەگوێرەی ئەو لێکۆڵینەوانەی پەیوەندیان بە لایەنی جوغرافیای مێژوویی عێراقەوە هەیە گرینگە، چونکە ئەو جۆرە لێکۆڵینەوانە لە دەرکەوتنی شارستانییەتدا بایەخی خۆیان هەیە. بەرهەرحاڵ لەپاڵ گەلێك هۆی دیکەوە ئاووهەوا کارێکی کاریگەری هەبووە لە سەرهەڵدانی شارستانیەت دا.

هەر بەنموونە تەماشا دەکەین گەرمی لە ڕادەبەدەری ئەو وڵاتانەی کەوتوونەتە سەر هێڵی ئیستیوا هانی سەرهەڵدانی شارستانیەتی نەداوە، چونکە تەمەڵی و نەخۆشی و پێگەیشتنی

پێش وادەو پێربوونی پێش وادە کە ئەمەش گشتی بەهۆی ئاوو هەواوەیە، وای کردووە دانیشتووانەکەی رەنج بدەن و کەمتر بەتەنگە رووەکانی دیکەی ژیانەوە بن کە شارستانیەت دروست دەکەن.[18]

بەگورتی هۆی جوغرافی باوەکو نەتوانن شارستانیەتیش بخولقێنن، بەڵام ڕێخۆشکەری پەرەسەندن و نەش و نمایەتی. بەرچاوترینی ئەو هۆیانەیش کە لە عێراق دا مەیسەر بوون و بەشداریان لەسەر هەڵدانی کشت وکاڵ دا کردووە ئەمانەن:

یەکەم: ئاوهەواو شوێنی جوغرافی

-:

وەك دیارە عێراق شوێنێکی جوغرافی گرینگی هەیە چ ئێستاو چ لە مێژووی کەونەرای دا، کە هەرسێ قاڕەی تیادا پێك دەگەن، ئەمەش بەگوێرەی بازرگانیشەوە هەمیشە بایەخێکی ستراتیژی هەبووە.

لەلایەکی دیکەوە دەکەوێتە بەشی باشووری ناوچەی فێنکایی و لە هەرێمی ڕۆژئاوای قاڕەکانیشەوەیە، ئەم شوێنانەیش وەك ئاشکرایە ئاووهەوایەکی ڕاگوێستەو گۆڕاوی هەیە، لە نێوان ئاووهەوای گەرمی بیابان و ئاووهەوای حەوزی دەریای ناوەڕاست ە دا.[19]

بۆ بەشە سروشتییەکانیش؛ دەتوانین سێ جۆرە ئاووهەوا بەپێی بەشەکانی ڕووپێوی دیاری بکەین کە ئەمانەن:

أ ـ بەشی شاخاوی و نیمچە شاخاوی: یەگشتی ئەم بەشە چیاکانی باکوورو ڕۆژهەڵاتی باکوور دەگرێتەوە.

ئاووهەوای فێنکەو لە چەشنی ئاووهەوای ناوچەی دەریای ناوەڕاستە؛ کە ساردی زستان و گەرمی هاوینانی مام ناوەندییە، ساڵانەیش لە (٤٠ تا ١٠٠) سانتیمەتری باران لێ دەبارێ..

مام ناوەندیێتی ئاووهەوایش لە زستان و هاوین دا، هەروەها ڕێژەی باران بارین بەسەر بۆ ئەوەی چەشنەها کشت وکاڵی لێ بکرێ.

ناوچە شاخاوی و نیمچە شاخاوییەکانیش پێنج یەکی ڕووپێوی عێراق پێك دێنن؛ لە ڕۆژهەڵاتەوە لە سنووری ئێرانەوە دەست پێ دەکاو لە باکووریش لە سنووری تورکیاو سوریاوە تا ئەوەی لە سنووری دەشتەلیتاوییەکان دا دەبێتەوە بەرزایی و گردۆلکە

بەشی نیمچە شاخاویش لە بناری چیاکانەوە بەلای ڕۆژئاوا باشووری ناوچە شاخاوییەکانەوە دەست پێ دەکا، ڕووبارو ڕووبار بەردەوام دەبێ تا دەگاتە سنووری سوریا بەلای ڕۆژئاوادلو لێوارەکانی باتی ڕۆژئاوا، بەلای باشووری ڕۆژئاوادا (سەیری نەخشەبکە).

ئەم ناوچەیەش بەهۆی بەرئاوی و باران بارینەوە لەوەرگەی خۆشی لێ هەڵکەوتووەو ماڵاتی لێ بەخێوەکرێ.

دیسان بەرزی و نزمی ناوچەکەو لقەکانی ڕووباری دیجلە بای ئەوەی تێدایە سوود لە دروستکردنی بەربەست ببینرێ، بۆیە دەبینین چەندین پرۆژەی لەو جۆرەی لێ دامەزراوە وەك پرۆژەی (دوکان) لەسەر ڕووباری زابی بچووك و (دەربەندیخان) لە سەر ڕووباری دیالە، تەنانەت پاشماوەی پرۆژەی کۆنیشی تێدایە، دیارترینیان ئەو بەربەستەیە کە لە کۆنەوە لەسەر ڕووباری عوزێم دا دامەزراوە.

ب ـ دەشتەلیتاوییەکان: دەشتە لیتاوییەکانی باشوورو نێوەڕاستی دەلتای ئەو دەشتاییانە لە یەك گەیشتنی هەردوو ڕووباری دیجلەو فوراتدا پێك دێ..

بەهۆی ئاووهەوای گەرمیشی لەو ناوچەیەدا و کەمی باران، هەر لە کۆنی کۆنەوە پرۆژەی ئاودانی تێدا هەبووە.

دۆڵی فوراتیش کە نەختێك لە دۆڵی دیجلە بەرزترە، وەك دیاردەیەکی سروشتی هەمیشە سوودی لێ وەرگیراوە لە لێدانی جۆگەلەو ڕووبارۆکەی وا کە ئەو دەشتاییانەی پێ ئاودراوەو لە ئاکامدا کشت وکاڵێکی بەرفراوانی لەبەرکراوە.[20]

حـ ـ بیابان و ناوچە دەشتاییەکان: کە لە باکووردا

ئاووهەوای فێنکی دەریای ناوەڕاستیان هەیەو لە ناوەڕاست و باشووریشدا ئاووهەوای بیابان.

دووەم: سەرچاوەو ڕووبارەکان

---

لەپاڵ لافاوی زۆرو بەرفرەی دیجلەو فوراتیش، ئەگەر

چاوەدێری نەکری و بەری نەگیری بەهۆی سروشتی خاکەکەوە کارەساتان دەقەومێ.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دوو ڕووبارە هەر لە کۆنەوە کۆڵەکەی کشت وکاڵ بوون، تەنانەت شارستانیەتی عێراقی دێرین و گەشەسەندنی هەر لە سەرتاوە بەهۆی ئەو دوو ڕووبارەوە بوو.

بایەخی ئەو دوو ڕووبارەیش لەوەدا دەردەکەوێ کە هەر هەوارگەو گوندە کشت وکاڵیە دێرینەکان لە قەراخی ئەو ڕووبارانەدا بووە، ئەوە ئەگەر باسی بایەخیان لە ئاوەدان و گەشەسەندنی بازرگانیو وەك هۆیەکی گواستنەوەیش نەکەین.

هەر بۆیە هەمیشە بەچاوێکی پیرۆز سەیریان کراوەو تەنانەت هێندێ جار بەخوداوەندی زایەندەی هێزە سروشتیەکان ژمێرراون.

بەگوێرەی پرۆژەکانی ئاودانیش، زۆر هەبوون، ئایەتیو گشتی. تەنانەت لە ناوچە شاخاویو نیمچە شاخاویەکانیشدا. ئەوەتا نووسینەکانی شای ئاشوریان سەنحاریب (٧٠٤ ـ ٦٨١ پ.ز) باسی پرۆژە تایبەتیەکەی دەکەن کە ئاوی گەیاندووەتە نەینەوای پایتەخت.[٢١]

ناوچەکانی باشووریش لە نیشتەجێ بوونی بۆیەکەم جاری ئادەمیزادەوە بەهۆی کەم بارانیو بەرزیو ئاوەرۆی ڕووبارەکان پشتی تەواویان بەدێران بەستووە، بۆیە دەبینین دەورووبەری شاری ئوروك (وەرکا) هەر لە هەزاری چوارەم ڕا لە سەرجیابی کشت وکاڵ بەلای پیشەسازیو بازرگانیدا شکاوەتەوە.

لە پاڵ ئەم هۆیانەشدا، خاکی بەپیتی زۆر شوێنی عێراق کە لیتەی بە پیتی ڕووبارەکانی پێکیان هێناوە هۆیەکی دیکەیە. . .

● بەشی دووەم ●

## سەرچاوەکانی لێکۆڵینەوە

سروشتی لێکۆڵینەوەو چارەسەرکردنی هەربابەتێك لە لایەنی مێژوویی‌یەوە بەتایبەتیش ئەو بابەتانەی پێوەندی بە ڕابوردووەوە هەبێ چ جای ڕابوردوویەکی دێرین، هەر لە سەرەتاوە لێ‌توێژ (کە هەڵبەت دەبێ پەیرەوی ڕێگایەکی زانستیانە بکا) پێویستی پێیان دەبێ و پشت بەو بەڵگەنامانە دەبەستێ کە لەبەر دەستی دان و سەرچاوەی لێکۆڵینەوەینی.

نیشانە بەم ڕاستیانە دووجۆرە سەرچاوەمان بۆ لێکۆڵینەوەی کشت وکاڵ لە عێراقی کۆن دا هەیە:

١ ـ سەرچاوە ماددیەکان

٢ ـ سەرچاوە نووسراوەکان

### یەکەم سەرچاوە ماددی‌یەکان

مەبەست لە سەرچاوە ماددی‌یەکان، پاشماوەی ئەو شوێنەوارە دێرینانەیە، کە لە ماوەی جیاجیادا دۆزراونەتەوەو هی ڕۆژگاری جیاجیان. .

بەگوێرەی کشت وکاڵیشەوە کە لەم باسەدا مەبەستە، هەموو ئەو دۆزراوانە دەگرێتەوە کە بە پاچی پشکنەرە ئارکیۆلۆژیەکان دۆزراونەتەوە.

ئەم جۆرە سەرچاوانەیش لە سەرچاوەی‌تر چاتر جێی متمانەن، چونکەوەبینیرێن و بەدەست دەگیرێن و بەمەودایەکی بەرجەستەیش ڕابردوو دەگێرنەوە.

بەرچاوترینی ئەو سەرچاوانەیش کە چالاکی کشت وکاڵیمان لە ڕۆژگارەکانی دێرین دا بۆ دەگێڕنەوەو بەڵگەی بەردەست و باوەڕپێکراون بوونی ئەوچالاکی‌یانە دەسەلمێنن ئەمانەن:

١ / (دانەوێڵە بە خەڵووزبووەکان و عەمبارەکانیان)

ئادەمیزاد پێش ئەوەی پەی بەکشت وکاڵ ببا دانەوێڵەی ناسیوە، ئەو دەمەی لە قۆناخی کۆکردنەوەی بژێوی‌دا بوو و پشتی پێ‌دەبەست؛ پاشان بەرەبەرە هەندێ جۆشنی لەو دانانە بە چاندن تاقی کردەوەو ماڵی کردن، بەم جۆرە سەرەتای کشت و کاڵێکی دیاری‌کراو سەری‌هەڵدا.

نموونەی ئەو دانە ماڵی کراوانە بەخەڵووز بوویی لە گوندی (چەرمۆ)ی کشت و کاڵیدا دۆزراوەتەوەو ئێستا لە مۆزەخانەی

عێراقی دا لە بەغدا پارێزراون.

واپێ دەچێ ئەو سەردەمە لە چەرمۆدا بەهۆی کوورەوە برژێنرابێ پاشان هاڕرابێ و کرابێتە نان، یان کرابێ بە شۆرباو دەگونجێ لە سەرەتایشدا هەر ئەو شۆرباوەیی و ترشایی و بوویێ بە (بیرە) کە لە گەلێ لە تێکستە نوسراوەکانی لەوەبەدوادا ناوی دێ..

بۆ ئەمباریش گومانی تێدا نی یە کە عەمبارەکان پێمان دەڵێن بەرهەمی زیاد لەبەکارهێنان هەبووە بۆیە لە عەمباران کراوە. پشکنینی ئارکیۆلۆژی بوونی ئەو جۆرە عەمبارانەی سەلماندووە کە ئەمەیش بەڵگەیەکی ترە بۆ لێ تۆژ لە لیکۆڵینەوەی دا.

لێرەدا جێی باسە بڵێین تاکو ئێستا لەو هەوارە کشت وکاڵی یانە چەند جۆرێ لەو عەمبارانە دۆزراونەتەوە؛ جۆرێکیان لەوانە بەپاڵ ماڵەوەیە و بریتی یە لە ژوورێکی بچووکتر لە ژووری گوزەران.. یەکێکی دی بازنەیی یە، هەیش بووە لە شێوەی چاڵ و خەندەك دا بووە.[22]

٢/ (کۆخ و کۆڵیتەکان)

کۆلیت و کۆخەکان لەو بەڵگانەن کە بە راشکاوی بوونی کشت وکاڵمان لە چاخە کۆنەکاندا بۆ دەسەلمێنن. چونکە نزیکی ئادەمیزادی دێرین لە کێڵگەو جێگیر بوونی مەرجێکی سەرەکی سەرکەوتنی پرۆژە کشت وکاڵی یەکان بووە،

بەهۆی ئەوەی کێڵگە هەمیشە کاری وەناوهێنان و پەروەردەی دەوێ لە ئامادەکردنی زەوی یەوە بگرە بۆ چاندن تا کێڵان و تۆدان و ئاودان و درووێنەو داکردن، تەنانەت ئاڵ و گۆڕکردنیشی لەو کاتەی بەرهەمەکە لە رادەی بەکارهێنان دا رەت دەکا.

پشکنینی ئارکیۆلۆژی زۆر لە گوندە کشت وکاڵیەکان دەریان خستووە کە زۆربەی زۆری ئەو کۆخ و کۆڵیتانە لە قوڕ دروست کرابوون، ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەڵگەی جێگیر بوونە، هیچ کۆمەڵگایەکی جێگیریش ئاشکرایە بەبێ خۆراك نابێ؛ کەواتە بوونی کۆخ و کۆڵیتی قوڕیی، واتە بوونی کشت وکاڵ بۆ مسوگەر کردنی بژێوی.

٣/ (ئامێر و ئامرازی کشت و کاڵی)

کۆمەڵێك ئامێر و ئامرازی کشت وکاڵی لەو هەوارگانەد دۆزراونەتەوە وەکو جۆنی و دەستاڕ و ئامانی دیکەی تۆدان، کە هێندێکیان لەوانە لە مۆزەخانەی عێراقی دا پارێزراون،[23] سەرەڕای ئەوانەی لە سەردیوار و مۆرە لوولەیی یەکان دا هەڵکەندراون.. بۆنموونە پشکنەرە ئارکیۆلۆژیەکان گەلێك ئامێر و ئامرازی لەم بابەتەیان دۆزیوەتەوە کە هەموویان سەربەو چەرخەن (چەرخی بەردینی نوێ) کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەڵگەی ماددی و بەردەستن و بوونی کشت وکاڵ و رادەی پێشکەوتنی لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر دەچەسپێنن.

لە ناوچەی باشووریش (پێمەرەیەك) دیتراوەتەوە کە لە کشت وکاڵ دا بەکارهاتووە، تەنانەت هەندێ، ئەوەی پێ ی دەڵێن خشتی (راستی کوور) لەو پێمەرەیە دەزانن چونکە هەڵگەرتنی هەر شەپلەقوڕێك لە زەوی بەو پێمەرەیەو هەڵگێرانەوەی بەسەر شوێنی پێویست ئەو شێوەیە وەردەگرێ[24] کە ئەم چەشنە خشتەیش زیاتر لە بیناسازی سۆمەرییەکانی بەرایێ دا بەکارهاتووە.

٤/ (ئیسقانی ئاژەڵە ماڵی کراوەکان)

لەئەنجامی پشکنینی هەندێ شوێنەواری چەرخی بەردینی نوێوە، گەلێك پارچە ئێسك و پروسکی گیانلەبەرە ماڵی کراوەکان دۆزراونەتەوە، هەر بە نموونە کۆمەڵێکی چاك لەو پارچە ئیسقانانە لە چەرمۆدا دۆزراونەتەوە.

ماڵی کردنی گیانلەبەریش هەنگاوێکی گرینگە لە رێگای جێ نشین بوون دا، نەك هەر بۆ کۆمەڵگایەکی شوانکارە بەڵکو بۆ دروست بوونی گوندانیش، چونکە زۆر لەو ئامرازە وردانەی کە لەمەوپێش ئاماژەمان بۆکرد و ئادەمیزاد لەژیانی رۆژانەیدا بەکاری دەهێنان لە ئیسقانی ئەو گیانلەبەرانە دروست دەکران؛ وەکو دەرزی و سوژن و ئامرازی وردیلەی تر، بێجگە لەوەی کە سەرچاوەی بژێوی رۆژانەی ئادەمیزادیش بوون لە بەکارهێنانی گۆشت و پێستەو سپایی.

٥/ (مۆرە لوولەیی و چاپەکانیان)

مۆرە لوولەیی یەکانیش زانیاریمان لە بارەی گەلێك لایەنی ژیان و گوزەرانی ئەوان سەردەمە دێرینانە دەدەنێ.[25]

کۆمەڵێکی یەکجار زۆر لەو مۆرە لوولەییانە دۆزراونەتەوە کە

ژیانی کێڵگەو لایەنی دیکەی پێوەند بە کشت وکاڵمان بۆ ڕەنگ دەدەنەوە. بۆ نموونە:

- مۆرێکی لولەیی کە دیمەنی کێلان دەنوێنێ، بەئەمیری کێلان وتۆدانەوەو لە شاری (نیپور)ی سۆمەری دا دۆزراوەتەوە.

چاپی مورێکی دیکە، خوداوەند (باو)، خوداوەندی کشت وکاڵ دەنوێنێ کە دەوری بەگوڵەگەنم دراوە.

- چاپێکی دیکەی مۆرێکی لولەیی دی، خوداوەندی هەتاو (شوتشو) پیشان دەدا لەنێو گەمیەك دایەو گاسنێکی بەدەستەوەیە بە کورتی ئەو مۆرە لولەیی یانەی ژیانی کشت وکاڵیمان بۆ ڕەنگە دەدەنەوە ئەوەندە زۆر لە ژماردن نایەن.

٦/ (گڵێنە)

گڵێنە لە لێکۆڵینەوەی مێژوویی و ئارکیۆلۆژی دا شوێنی دیاری خۆی هەیە نەك هەر وەك بەڵگەیەکی ماددی و بەردەست کە بوونی دێ‌نشینان دەسەلمێنێ، بەڵکو بەهۆی بەربڵاوی و بوونی لەزۆربەی شوێنەوارەکان و پێوەندی پتەوی بەژیانی ئادەمیزاد هەر لە*مانە دێرینەکانەوە سەبارەت بەوەی بەرگەی سرو شت و دەوروبەر دەگرێت و گەلێك لایەنی هونەری و کولتوری تێدایە..

ئادەمیزاد لەچەرخی بەردینی نوێوە دوای ئەوەی بن بەردو ئەشکەوتەکانی بەجێ هێشت و جێگیربوو دەستی دایە کشت وکاڵ و گڵێنەیشی دروست کرد.

کەواتە گڵێنە (لەشێوەی گۆسکە، یا ئامانی بەکارهێنان یا سەروبێژ ینگ بێ یاخود بۆ تیاناشتنی مردوو یا هەر لایەنێکی دیکەی پێوەند بەژیانی ئادەمیزاد) لەگەڵ جێگیربوون و سەرهەڵدانی کشت وکاڵەوە.. بووە.

دکتۆر (هاری ساکز) لای وایە کە دلەقۆناخەکانی بەرایی دا گڵێنە بریتی بووە لە سواخدانی سەبەتەو تریانە بەقوڕ، کە دۆزینەوەی ئەم جەشنە گڵێنەیەش (لە شوێنەوارەکان دا) زەحمەتە،[٢٦] چونکە ئەم جۆرە گڵێنەیە توانای بەرگەگرتنی گۆڕانکاریەکانی سرووشتی نی یە بۆیە نموونەی نەماوەتەوە.

پشکنینی ئارکیۆلۆژ یش ژمارەیەکی زۆری گڵێنە لە هەموارە کشت وکاڵی یەکان دا دۆزیوەتەوە، لە چەرمۆو حەسوونەو سامەڕا.. تاد

٧/ (هەڵکۆڵراوەکان)

هەڵکۆڵراوەکانیش بە هەموو شێوەکانی یەوە سەرچاوەی ترن زۆریان ژیانی فەللاحەتیان بۆ تۆمار کردووین بۆ نموونە:-

- تەختە مەڕمەڕێك لە شاری (نیپور) دۆزراوەتەوە، وێنەی ژنە جووتیارێکی سۆمەری لێ تراشاوە شەنەیەکی بەدەستەوەیە تەختەکە بۆ هەزاری سێ یەمی* پ.ز دەگەڕێتەوە.

- یان دەفری نەزرگرتنەوەی پێنج تیخ، کە لە پاڵ ئەوەی فەلسەفەی سۆمەریەکانمان بۆدەنوێنێ. بایەخی ژیانی کشت وکالیشمان لە کۆمەڵگای سۆمەری دا بۆ دەردەخا. ئەو دەفرە شێوەی لە شێوەی گوڵدانێك دەکا و بە پێنج تیخان دابەش کراوە، کە هەر تیخێك لایەنێك دەنوێنێ؛ بەئاو دەست پێ دەکاو بە ئادەمیزاد (لەبەرزترین حاڵەتی دا) کۆتایی دێ. ئەم دەفرە ئێستا لە هۆڵی شارستانیەتی سۆمەریەکان لە مۆزەخانەی عێراقی دا لە بەغدا - پارێزراوە.

- هەڵکۆڵراوی دیکەیش هەن لە شێوەی دیواربەندا کە دیمەنی درەخت و شینایمان پیشان دەدەن و دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئاشووری یەکان، بۆ نموونە یەکێك لەو دیواربەندانە هی سەدەی حەفتی پ.ز و بریتی یە لە داوەتێك: (شاوشاژن لە باخچەدا نیشتوون دەخۆنەوە، چڵەمێوو هێشووی تری‌شیان بەسەردا شۆڕ بووەتەوە) ئەو هەڵکۆڵراوە لە مۆزەخانەی بەریتانی پارێزراوە.[٢٧]

هەر لە بارەی بەڵگە ماددیەکانەوە، نەخشەیەك لە کەلاوەی شاری نیپوردا دۆزراوەتەوە کە بۆ هەزاری دووەم دەگەڕێتەوە، بە ئاشکراو بەوردی شێوەی ژیانی کۆمەڵگای دێهاتنشینی ئەو سامان پیشان دەدا.[٢٨]

دووەم / سەرچاوە نووسراوەکان

---

بەڵگەنامە تۆمارکراوەکان لە مێژووی ئادەمیزاددا لە داهێنانی هۆی نووسینەوە دەرکەوتوون کە لە پێنج هەزار ساڵ

لەمەوبەر (مێژووی داهێنانی نووسینی مێخی لەلایەن سومەرییەکانەوە) نزیک دەبێتەوە.

پشکنینەکانی ئارکیۆلۆژی پەردەیان لە سەر کۆمەڵێکی زۆر لەو بەڵگەنامە وتێکستە نووسراوانە لاداوە، لەوانەیش ئەو بەڵگەنامانەی پێوەندیان بەکشت وکاڵەوە هەیە، بەتایبەتیش دوای فراوان بوونی گوندە کشت وکاڵییەکان و گەشەسەندنیان و زۆربوونی دانیشتووان و بڵاوەلێ کردنی جووتیاران و نیشتەجێ بوونیان لەپێشەکانی باشوور و نێوەراست دا.

سەرچاوەی نووسراویش ڕێژەیەکی ڕاستەوانەیی لەبەرابەر ئەو بەرەوپێشچوونەدا وەرگرت کە ژیانی فەلاحەتی بەخۆیەوەی بینی.

بەم ڕەنگە ئاماژە لە چاخە مێژووییەکان دا زۆرتر بوو.

ئێستا هەوڵ دەدەین ئاماژە بەهەندێ لەو تێکستانە بکەین:

سەرەتای پەیدابوونی نووسین وەك ئاشکرایە وێنەیی بوو، هەر لەو دەمەدا، لەو نووسینە وێنەییانەدا ئەو هێمایانە دەرکەوتوون کە پێوەندیان بە کشت وکاڵ و کاروبارییەوە هەبووە. لە پێشەوەی ئەو هێمایانەیش گوڵە گەنم بووە (گەنم وەك ماددەیەکی بژێوی گرنگ و خۆرکێکی سەرەکی)،

ئەمەیش لە تابلێتە قورییەکانی بەرایی‌دا دەرکەوتووە.

کە نووسینیش وەك هەموو دیاردەیەکی دیکەی شارستانیەتی دۆڵی رافیدێن بەرەو پێشتر چوو، ناوو باسی زۆر لە درەخت و ڕووەکانی تێدا دەبینینەوە، جگە لەو کارانەی پێوەندیان بە کشت و کاڵ و کێڵگەو ژیانی فەلاحەتییەوە هەیە، بەنموونە:-

تێکستێکی گرینگ وەختی خۆی دۆزراوەتەوە کە وەك وەرزانەیەکی کشت وکاڵییەو کۆنترین وەرزانەیە لە مێژوودا، لەسەر تابلێتێکی قوڕی و بەزمانی سۆمەری و نووسینی مێخی تۆمارکراوەو تەواوی ئەو هەنگاوانەی تێدا ڕوون کراوەتەوە کە جووتیار پەیڕەویان بکا لەوەختی تۆدانەوە بگرە تا دەگاتە دروێنە.[29] لەو تەختە ڕنگانەیش بەرێوەبەرایەتی شوێنەوارەکان لە ئەکادیمیای (تەل حەرمەل)دا[30] دۆزیویەتەوە، تەختەیەکە کۆمەڵێك تێکستی مێخی لەسەر تۆمارکراوە، هەر هەمووی بریتییە لە ناوی ڕووەك و درەختان.

تێکستی باسا کۆنەکانیش زۆر دەقی پێوەندار بەکشت و کاڵی تێدا دەبینرێتەوە، ئەوانەی باسی ڕێکخستنی کاروباری کشت و کاڵی دەکەن و ژیانی کۆمەڵگای کشت و کاڵمان بۆ لێك دەدەنەوە.

تێکستی مێژوویش سەرچاوەی بایەخدارن بۆ لێکۆڵینەوەی کشت و کاڵ لەو سەردەمانەدا، چونکە هیچ هێرشێکی سەربازی نەبووە باسی خۆراك و خواردەمەنی (ئازووقەی سوپا)ی تێدا نەهاتبێ، جگە لەو ئازووقەو خۆراکانەی لە شەڕان دا دەستیان بەسەردا گیراوە..

تێکستی ئەدەبیش هەر بەوجۆرە، زۆر لە چیرۆك و سەربردەو داستانی پاڵەوانیەتی و ئەفسانەو کۆمەڵەی پەندو قسەی نەستەق باسی کشت وکاڵ و ژیانی کشت وکاڵیان تێداهاتووە. لە گەلگامشەوە بگرە تاوەکو داستانەکانی پێوەند بە بوون و ئەوەی بە ئەدەبی ڕووبەڕووبوون (مناظرة) ناسراون..

لەوانە:

تێکستێك باسی جیاوازی نێوان جووتیارو شوان دەکا، کە جووتیار نموونەی کۆمەڵگایەکی شارستانی و جێگیرەو لەمەشدا بەسەر شوانی‌دا هەیە، ئەوەتا (ئینەنا)ی خوداوەندی جوانی و خۆشەویستی شووکردن بە (دموزی) شوانکارە ڕەت دەکاتەوەو (ئانکی - ئاملو)ی جووتیاری پێ باشترە کە (ئەمبارەکانی بو پڕ لە دانەوێڵە دەکا)و دەڵێ:

«ئەمن شوو بە شوان ناکەم و
پۆشاکی زبریم ناوێ
منی هێشتا کچ شوو بە جووتیار دەکەم
جووتیار کە ڕووەکی هەمەجۆر دەڕوێنێ
جووتیار کە دانەوێڵەی جۆراوجۆر دەچێنێ»[31]

هەواڵی کشت وکاڵ لە سترانەکانی ئاهەنگی تایبەت بە (زەماوەندی پیرۆز)یش دا هاتووە،[32] ئەو زەماوەندەیش کە ساڵانە بەرپادەکرا شا (نوێنەری دموزی خوداوەند)ی پێشکەش بە کاهینەی نوێنەری (ئینەنا) دەکردو دەیگوت:-

«ئەوە خوایە، گەورەم کە بۆ بەر دڵم هێناوی چێژ وەربگری،

پاشا، مێردی خۆشەویست عومرێکی درێژ لە دەرباری پیرۆزت دابێ
لەوێرا ڕۆژی لێ هەڵدێ، تا ئەوێی لێی ئاوادەبێ
لە باشوورەوە بۆ باکوور
لە دەریای ژووری بۆ دەریای ژێری
لەوێرا کە داربەڕووی تێدا دەڕوێ
تا ئەوێی داری ئوورزی لێ ئەڕوێو
بەهەموو وڵاتی سۆمەرو ئەکەد
دارعەساو سەوڵەجانی پێ ببەخشێ.
بەڵکو وابکا کێڵگەکانیش وەك جووتیاران حاسڵاتیان بێ
لەسێبەری فەرمانیدا، ئەوە خوایە شینایی زۆربێ دانەوێڵە زۆربێو
ئەوە خوایە ڕووبار هەستێو
ئاوەختێکی درەنگ لە کێڵگەدا بمێنێتەوەو
لە قامیشەڵان دا قامیشی کۆن پێبگاو هی نوێ باڵابگرێ
بەڵکو شاژنی پیرۆزی سەوزە وابکا
هێندەو هێندە دانەوێڵە بکەوێتە سەریەك و
لەکێڵگەدا خاس و تەرەتووڵە بەرز ببنەوەو
عومری لەکۆشکا درێژ بێتەوە.
ئەوە خوایە دیجلەو فوراتیش سەربکەن و
کە نارەکانیان گژوگیای لێ بڕوێو
بەمێرگان دابگیرێ»[٣٣]

لە جۆری ئەدەبیاتی ڕووبەڕووبوونیش دا، کە هەر لە زوویێکەوە ژیانی کشت وکاڵی بەرجەستە کردووە، گەلێك دەقمان کەوتووەتە بەردەست لەوانە: ڕووبەڕووبوونی نێوان:-
- داس وگاسن و
- خوداوەندی گەنم و خوداوەندی پێچۆڵ و
- گەنم و جۆ
- هاوین و زستان و. . . تاد.
هەر بەبۆنەی ناوهاتنی هاوین و زستان
ئەفسانەیەکی سۆمەری هەیە بەناوی ئەفسانەی: (ئیمیش Emesh و ئێنتن ـ Enten) کورتەی ئەم ئەفسانەیە دەڵێ:-

«ئینلیل بڕیاریدا کشت وکاڵ لە وڵات دا دابمەزرێنێ، بۆ ئەمەیش دوو برای دروست کرد، ئیمیش (هاوین) وئێنتن (زستان)، هەریەکەشیان کارو ئەرکی خۆی بۆدیاریکرد؛ بەنموونە (زستان) ئەرکی ئەوەبوو ببێتە هۆی زانی مەڕوبزن و مانگاو زۆربوونی سپایی و. . . تاد.
بەڵام هاوین ئەرکی ئەوەبوو کێڵگەکان پڕ لە دانەوێڵە بکاو ئەمبارو جۆخینان دابگرێ.»[٣٤]
لە جیهانی پەندو حیکمەتیشدا کە لەم چەند ساڵانەی دواییدا لێیان دۆزراوەتەوە هاتووە:
- گای بێگانان گیای دەخواو هی خاوەن کێڵگەیش لە برسان مۆڵ بووە.
یان - ڕووباری بەڕەوبا، ئاوی زۆری دێ بەدوا
یا - کرێکاری بێ سەرپەرشت وەکو کێڵگەی بێ جووتیار وایەو. . . تاد.[٣٥]
داخۆ دەبێ ئاوی زۆر مەسەلا بۆچی بێ، ئەگەر بۆ پرۆژەی کشت وکاڵ نەبێ کە سەرچاوەی بژێوییە، بەتایبەتیش لە باشووردا کە ئارادەیەکی زۆر پابەندی ئاودان بوو.
جۆرێکی دیکەی تێکستە میخیەکان کە باسی ڕووەکیان تێدا هاتووە، نووسراوە پزیشکییەکانە، کە لە هەمان وەختیش ناوەکانیشی بۆچەسپاندووین: «نۆژداری عیراقی کۆن پشتی تەواوی بەڕووەکەوە بەستبوو لە ئامادەکردنی داو دەرمانی پزیشکی دا»[٣٦]
هێندێ لەو نووسراوە پزیشکیانە تاك تاك نووسراون هێندێکی دیکەیان کراونەتە دوویەش، یا ڕاستر هەردوو ڕووی تابلێتەکەی گرتووەتەوە؛ ڕوویەکی ناوی ڕووەکانی لەسەر تۆمارکراوە ڕووەکەی دیش بەکارهێنانی وەك دەرمان.
لەنووسراوە سیحرییەکانیش دا کە بۆمەبەستی پزیشکی بەکار هاتوون (نۆژداری سیحری)، ئەخۆشیان بۆبەکارهێنانی هێندێ جۆری ڕووەك ڕاسپاردووە.[٣٧]
ئەو درەخت و ڕووەکانەی لەو دەقانەیش دا هاتوون بەنموونە:
- درەختێك نیشانەی (لام ـ Lam) ەو لە ڕەگەزی دار بەڕووەو پاشان بابلی و ئاشوورییەکان بە نیشانەی (لامو ـ Lamu) کە

دەکاتە داربەڕوو وبۆ میزگیرانیان بەکارهێناوە.

- چەشنێك لە چەشنەکانی دارسنەوبەریان سەروکە لە نووسینە میخیەکان دا بە (لی‌پار - par - li) هاتووە.

- داری نوورز کە شیلنەری سێیەم (سەدەی (٩) نۆی پ.ز) لە کۆتەڵەکەی‌دا کەبە (کۆتەڵی ڕەش) بەناوبانگە داهاتووە.[٣٨]

- سێوو ترێ و هەنجیر و داری تریش کە لە بەشێکی تایبەتدا باسی دەکەین.

## ● بەشی سێیەم ●
## یاساکانی ڕێکخستنی کشت و کاڵ لە عیراقی کۆن دا

دوای ئەوەی گوندە کشت وکاڵی یەکان فراوانتر بوون و بوون بەشار و سەبارەت بە زۆر ئەگەران کشت و کاڵ پەرەی سەند، لە پێشەوەی ئەو ئەگەرانەیش بەکارهێنانی هۆیەکانی ئاوکان بوو کە بووە هۆی پتەربوونی بەرهەم و پاشانیش بوژانەوەی ئابووری؛ چونکە کشت و کاڵ بۆ کۆمەڵگای عیراقی ئەوسا سەرچاوەی بژێوی وبناغەی ژیان بوو، بێجگە لەوەی کەرەستەی خاوی پیشەسازیش بوو. بەم پێیە دەورێکی گرینگیشی لە بنیاتنانی شارستانی‌یەتی دا بینی. بەهۆی ئەو بایەخە ئابووری‌یەیشەوە، هیچ دەقێکی نووسراو نی‌یە ئاماژەی بۆ نەکردبێ؛ لەسەردەمی شارستانیەتی سۆمەریەکانەوە بگرە تا بە سەردەمە هەر دواییەکانی ئیسلام رادەگا.

نیشانە بەو دەورەیشەوە، جێی گومان نی‌یە ڕێکخستنی کاروبارەکانی بەهۆی یاساوە پێویستیەکی پێویست بووە لە هەموو قۆناخەکاندا دیارە کە «پێویست بە یاسا بوون و ڕێنوێنی عەدالەتی کۆمەڵایەتیش لەوکۆمەڵگایانەدا دەگاتە قۆناخێك کە ئەشونمایەکی سیاسی و کۆمەڵایەتیان کردبێ و پێ گەیشتبێ»[٣٩]

لەم ڕووەوەیش کاروباری کشت وکاڵ لە عیراقی کۆن دا بەهۆی ڕێگای جۆراوجۆرەوە ڕێکخرابوو، لە پێشەوەی ئەو ڕێگاو هۆیانەش، یاساو ڕێککەوتنامەو دیاری کردنی ملکایەتی بوو. تێکستی لەم بارەیەشمان لە هەموو قۆناخە مێژوویی‌یەکان دا بۆ ماوەتەوە، لە چاکسازی‌یەکانی (ئورکاجانیا)ی دادوەری شاری لەگەشەوە بگرە (سەدەی ٢٤ پ.ز) کە دیارە کۆنترین چاکسازی دنیایە،[٤٠] تا بە یاسای (ئورنەممۆ)ی دامەزرێنەری بنەچەی ئوری سێیەم (٢١١٣ - ٢٠٩٥)پ.ز رادەگا، کە بەکۆنترین یاسای نووسراو دادەنرێ و یاسای (لبت عەشتار)ی پێنجەمین پاشای بنەچەی ئیسن (١٩٣٤ - ١٩٢٣ پ.ز)، ئینجا یاسای شانشینی (ئیشەونا) تا دەکاتەوە یاسای بەناوبانگی (حامورابی) کە بەتەواوترین یاسا دادەنرێ لەوانەی تا ئێستا دۆزراونەتەوە؛ هەرچەندە یاسا سۆمەریەکانی لە پێشدا هاتوون، هەروەها یاسا ئاشووری‌یەکان کە زیاتر پشتیان بەیاسای حامورابی‌یەوە بەستووە.[٤١]

لێرەوە هەوڵ دەدەین؛ ئەوەندەی پێوەندی بە باسەکەمانەوە هەبێ ڕۆشنایی بخەینە سەر ئەو یاسایانە، هەروەها هەوڵ دەدەین ئاماژە بۆ ئەو نامەو بەڵگەنامانەیش بکەین کە لە بەینی فەرمانڕەوایەن دا ئاڵ وگۆڕ کراون لەوەندەی پێوەندی بە کشت و کاڵەوە هەبێ. ئەمەیان لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە نابێ ئەو حەقیقەتەشمان لەبیر بچێ کە (پەرستگا)یش وەك دامەزراوێکی ئایینی و دنیایی دەورێکی ئارادەیەك سەرەکی لەرێکخستنی کاروباری کشت و کاڵی دا دیوە. کە هەڵدەگرێ باسێکی سەربەخۆی لە سەر بنووسرێ.

یەکێك لەو نامانەی کە لە سەردەمی بابلی دا ماوەتەوە لە خاوەن زەوی‌یەوە بۆ سەرکارەکەی ناردووە داوای لێ دەکا کە بەپێی ویستی جووتیارە کرێگرتەکان حەقیان بداتێ بەچاوپۆشین لەوەی لە کۆتەلەکەدا هاتووە.[٤٢]

لە بەڵگەنامەیکی‌تردا کە ڕێککەوتنێکی تایبەتی دەنوێنێ و باسی فرۆشتنی کێڵگەیەك دەکا.. ڕێکەوتنێکە بە زمانی ئەکەدی نووسراوە (هەرچەندە زۆربەی زاراوەکانیش سۆمەرین) تێدا هاتووە: - «ملکایەتی ئەو کێڵگەیە بەشایەدی فلان و فلان گوێزرایەوە بۆفلان.. لەپاشان دا دێتە سەر سوێند خواردن بەخوداوەندو بە پاشا کە ئیلتیزام بەناوەرۆکی بکرێ.»[٤٣]

بۆ زامن کردنی ڕێککەوتنیش عیراقی‌یە دێرینەکان کڕین و فرۆشتنیان بە پسوولە زامن کردووە؛ یەکێك لەو پسوولانەی کەهی سەردەمی سۆمەری نوێیە بەم شێوەیەیە: «بەرخێکی مردو (مرداربوو) نالۆ لە ڕۆژی ٢٣ی ئورنیکاردا وەری گرت لە مانگی جۆدرەو لەو ساڵەیدا کەشاری (هەولێر)ی تێدا وێران کرا». [٤٤]

دەبینین لێرەدا پسوولەکە بە مانگی جۆدرەو مێژوو کراوە.

بەگوێرەی یاسایشەوە، وتمان، سەرەتا چاکسازی‌یەکانی ئورکاجینا[٤٥] بوو کە (لەخوداوەند دەترسی و ڕێزی ملك و ماڵی دەگری) بەم جۆرە ملك و زەوی و زارەکانی گەڕاندەوە ژێر فەرمانی پەرستگا لە کاتێکدا «ماڵی ئینی ـ enai (میر)و کێڵگەکانی و ماڵ و کێڵگەی ژنەکانی وێك کەوتبوونەوەو باج و خەرج سێنەکانیشی وڵاتیان پڕکردبوو» نەك هەر ئەوەش چاکسازی‌یەکانی ئورکاجینا ئاماژە بۆ دیاردەی بەسوخرە گرتنی کوێران لە هەڵکەندنی بیری کێڵگەکان دا..؛ کەوا پێ ئەچێ لەم کوێرانە کۆمەڵێکیان پێك هێنابێ.

یاسای (ئورنەممۆ)یش کۆمەڵێك بەندی پێوەند بەکێڵگەو ڕێکخستنی کاروباری کشت وکاڵی تێدایە بەنموونە لە ماددەی (٢٥)یدا دەڵێ: «ئەگەر کەسێ کێڵگەی کەسێکی دی بەزۆر وناوهێنا (بەکارهێنا)و خاوەن کێڵگە بەپێی یاسا داوای لێ کردەوەو زەوتکاریش گوێی پێ نەدا ئەوا تەنانەت ئەوەیش دەدۆڕێنی کە لە کێڵگەکەی خەرج کردووە». [٤٦]
لەم ماددەیەدا ئاشکرا دەبێ کە نابێ کێڵگەی غەیر زەوت بکرێ (؟١)

لە ماددەی (٢٨)یشدا دەخوێنینەوە کە: «ئەگەر پیاوێك بوو بەهۆی ژێر ئاوخستنی کشت وکاڵی یەکێکی دی پێویستە سێ (کور) جۆی بۆ هەر (ئایك)ێك لە کێڵگەدا بداتێ». [٤٧]

دیارە کە یاسای ئورنەممۆ بۆبەجێ گەیاندنی دادوەری مەبدەئی خستنە بەری بەکارهێناوە.

یاسای (لەبت عەشتار)یش هەر بەو جۆرە بووە، بەنموونە لەیەکێك لە بەندەکانی دا هاتووە: «ئەگەر پیاوێك درەختی لە باخچەی پیاوێکی دی ڕاقەناندن، لەسەریەتی نیو ـ مەن ـ زیوی لە بریکاریدا بداتێ». [٤٨]

لێرەدا دەبینین پاراستنی دارو درەخت، بەتایبەتیش داری بەبەر بەهەند هەڵگیراوەو بایەخی پێ دراوە (؟؟).

یان لە نموونەیەکی تری ئەم یاسایەدا هاتووە: «ئەگەر پیاوێك چووە ناو باخچەی پیاوێکی دی بۆ دزی و (وگیرا)، پێویستە (١٠) شیکڵ زیوی بداتێ.» [٤٩]

یاسای (ئیشنەونا)یش کە تابلێتە قوڕیەکانی لە (تل حرمل)دا دۆزرانەوەو هی سەردەمی بابلی کۆنە، لە ماددە (٧)یدا کرێی دروێنەی بە دوو (سووت)دانەوێڵەو دوانزە (حەبە) زیو دیاری کردووە.

لە ماددەی (٨)یشدا کرێی تۆ دەری بە سووتێك دانەوێڵە دیاری کردووە. [٥٠]

لە ماددەی (٩)یەمیشدا هاتووە کە: «ئەگەر کابرایەك شێکلێکی زیودا بەکابرایەکی کرێ گرتە بۆدروێنەو ئەگەر ئەو کابرایە دروێنەکەی بەتەواوی بۆئەنجام نەدا دەبێ لەبری ئەوە (١٠) شیکڵ زیوی بۆ بژمێرێ....» [٥١]

لێرەشدا ئیلتیزام کردن بە پەیمان بەتایبەتیش لەو کاروبارانەی پێوەندیان بە کشت و کاڵەوە هەبووە بایەخی پێ دراوەو بەهەند هەڵگیراوە.

- کشت وکاڵ لە یاسای حامورابی‌دا -

---

یاسای حامورابی کامڵترین یاسای نووسراوە لە نێو یاساکۆنەکانی عیراق، جگە لەوەیش تاکە یاسایشە کە بە دارشتنی خۆی و بەتەواوی گەیشتێتە دەستمان.

یاسای حامورابی لە هەموو یاسا کۆنەکانیش زیاتر باسی کاروباری پێوەندار بە کشت وکاڵی تێدا هاتووە [ماددە (٤٢) تا (١٠٠) ] وا لە خوارەوە نموونەی هەندێ لەو ماددانە دەخەینە بەرچاو: - [٥٢]

- لەماددەی ٤٢دا هاتووە: «ئەگەر کەسێ کێڵگەیەکی بۆ چاندن بەکرێ گرت بەڵام دانەوێڵەی تێدا نەچاند، جا ئەگەر دەرکەوت کێڵگەکەی نەکێڵاوە، پێویستە بەپێی کێڵگەی هاوسێ دانەوێڵە بە خاوەنەکەی بدا.»

- «ئەگەر جووتیارێك کێڵگەیەکی بە دانەوێڵە چاندراوی یا

بەکونجی چاندراوی مەروونە کرد، پێویستە لەسەر خاوەنی کێڵگە بەخۆی دانەوێڵە پاکونجیەکەی کە لە کێڵگەدا بەرهەم دێ وەربگرێ و دەبێ درهەمانیش لەگەڵ زیادەکە بۆ بازرگانەکە بژمێرێ - مادە / ٥٠، لە بارەی هەڵنانی بەربەستیشەوە لە مادە (٥٣)دا هاتووە: «ئەگەر کەسێ لە بەهێزکردنی بەربەستی کێڵگەکەیدا کەمتەرخەمی کرد و بەهێزی نەکرد و کەلێنێکی تێکەوت و ئاو زەوی جێراوی (کێڵگە)ی تێك دا، پێویستە لەسەر خاوەنی بەربەست لە بریتی ئەو زەرەرە دانەوێڵەی بداتێ.».

لەبارەی بەکرێدانی بێستانیش لە مادەی (٦١)دا هاتووە: «ئەگەر بێستانچی کێڵگەکەی هەموو نەچاند و پارچەیەکی بە بەیاری هێشتەوە، دەبێ ئەو پارچەیە لەگەڵ ئەو بەشە حیساب بکرێ کە بەری دەکەوێ»؛ مەبەستی بەشی کابرای بەکرێ دەرە.

لێرەشدا دەردەکەوێ کە هێشتنەوەی زەوی بە بەیاری هەر لەدێر زەمانەوە پەسند نەکراوە، لەوەیش دەچێ ئەمە بەهۆی زیادبوونی ڕێژەی دانیشتووان بووبێ..

وەك وتمان یاسای حامورابی ژمارەیەکی زۆری ماددەکانی بۆ کاروباری کشت وکاڵ تەرخانە؛ ئەمەیش خۆی لەخۆیدا بایەخ و ڕۆڵی کشت وکاڵمان لە ژیانی کۆمەڵگادا بۆ ڕوون دەکاتەوە، لە کاتێکدا ئەم یاسایە سەرچاوەیەکی بە پیشە بۆ لێکۆڵینەوە لەم مەیدانەدا.

## ● بەشی چوارەم ●

### پەنجەنمایەك بۆ هەندێ لەو ڕووەك و درەختانەی لە عیراقی دێرین دا ڕوواون و چۆنیەتی بەکارهێنانیان

بەڵگەنامە بازرگانییەکانی عیراقی کۆن پێمان دەڵێن کە ناردراوەکانی هەرێمی ڕافیدێن، بەتایبەتیش لە سەردەمی بابلی دا، بەشێکی زۆری بەرهەمی کشت وکاڵی بووە؛ وەکو گەنم و جۆ و خورما و ڕۆنی ڕووەکی و خوری کە بۆ ئێران و کەنداو نێردراوە.[٥٢]

گومانی تێدا نییە کە سەرمەرێژ و زیادە دەچێتە نێو ئاڵقەی ناردنە دەرەوە.

تێکستە مێخیەکانیش کە لە شوێنەواری جیاجیادا دۆزراونەتەوە بەتایبەتیش ئەوانەی (تل حرمل)، لیستەیکی زۆری لەو ڕووەك و درەختانە بۆ تۆمارکردووین کە ئەوسا، وەناوهێنراون، تەنانەت هەندێکیان لەوانە ئێستاش لە پێشەوەی ئەو بەرهەمە کشت و کاڵانەن کە دەنێردرێنە دەرەوەی وڵات، لەوانەیش: بێجگە لە گەنم و جۆ و دانەوێڵەی دی کە هەر لەکۆنی کۆنەوەماڵی کراون و چاندراون و وەناو هێنراون:

● دارخورما

——: زۆرشت لەبارەی دارخورما لەو بەڵگەنامانەدا هاتووە کە باسێکی بەتەنێ هەڵدەگرێ، سەبارەت بەوەی کە خورما یەکێك لەو بەرهەمە گرینگانە بووە کە بۆ (ئازووقەی سوپا) بەکارهاتووە؛ بەهۆی ئەو بەها - خۆراکییەی هەیەتی..

دارخورما لە زمانە سامییەکان دا ناوێکی هاوبەشی نییە، بەنموونە بابلییەکان پێیان گوتووە (گیشمارو - Gishmaru) کە لە ئەسڵدا لە وشەی سۆمەری (گیشیمار - Gishmar) هاتووە. - (خورما)یش بە سۆمەری پێیان کوتووە: (زو-لوم - ما Zu - Lum - ma)، ناوە بابلییەکەیشی (سلوم) هەر لەوەوە دەرهاورددراوە.[٥١]

سەرچاوە ئاشوورییەکانیش باسی جۆرە دارخورمایەك دەکەن و بە (دارخورمای باکوور) ناوی دەبەن، وادەردەکەوێ ئەم جۆرە دارخورمایە تایبەت بووە بە باکووری عیراق و لەباشووردا شین نەبووە تەنانەت جۆرێکی دیکەیشیان باس کردووە پێی گوتراوە (دارخورمای شاخ)[٥٥]

هەندێ کۆڵراوی ئاشووریش، کەچەند دیمەنێکی شەڕەکانیانمان پیشان دەدەن، لەوانە یەکێکیان خەریکن لە خاکی دوژمن دارخورمایان

رادەقەنێن و هەڵدەکێشن بەمە بەستی ئەوەی ئازووقەیان؛ کە سەرچاوەی بژێویانە ببڕن . . . !

دارخورما لە تێکستە ئەدەبی یە دێرینەکانیشدا باس کراوە، نۆژداری بابلی و ئاشووریش خورمایان بۆ چەندین مەبەست بەکارهێناوە وەکو بەکارهێنانی بۆ گووان و برینی پیس بوو بە تێکەڵ کردنی لەگەڵ ڕۆن و هەروەها بۆ گوێ . .

دەبسان دۆشاویشان لەگەڵ گوڵا و بۆ نەخۆشی گەدە بەکارهێناوە .

**• چەوەندەر**

———: چەوەندەر هەر بەو دارشتەیە ماوەتەوە کە لە سۆمەری‌دا پێ‌ی ناسراوە (سوەوندەر - Sumndar) کە ئیشارەتی پۆل و ڕەگەزیشی لەگێشە . . چەوەندەر وەك تێکستە میخیەکان دەڵێن بۆگیرانی (خۆرسك) هەبووە، بەتایبەتی لەبەشی باکووری عیراق دا .

لەبەکارهێنانی نۆژداریشدا بۆ ئاوسان و برینی قاچ، هەروەها بۆ مبزگیران ووەك یارمەتیدەری خواردمەنیش بۆ هەرس کردن بەکار هاتووە .

**• کەوەر**

———: لەتێکستە میخیەکانی سەردەمی بابلی‌دا بە(کراشۆ) هاتووەو بە سۆمەریش پێ‌یان گوتووە (کا - ڕاش)، وادیارە (کراشۆ)یش هەر لەوەوە هاتووە .

کەوەر لە نۆژداری کۆن دا بۆ ددان ئێشانیان بەکارهێناوە، هەروەها بۆ ئێشی ڕەحمی ژنان گەنجی لە هێندێ سەرچاوەدا خواردنی قەدەغەکراوە؛ بە نموونە لەکاتی چاو ئێشان دا، هەروەها حەفتەمین ڕۆژی مانگی بابلی

لەگەڵ ماسیش نەخوراوە، چونکە پێ‌یان رابووە کە خواردنی کەوەر لەگەڵ ماسی‌دا دەبێتە هۆی ئەوەی دووپشك بەر کەسەوە بدا خواردوویەتی .[٥٦]

**• پ.ـاز**

———: پیازیش لە سەرچاوە میخیەکان دا بە شێوەی (بەسرو)ی بابلی و ئاشووری هاتووە، بەڵام لە لیستەی ڕووەکاندا پاشگرێکی سۆمەری پێوەیە ئەویش (سی - سیکل Se - Sikil - sar) کە لە بابلی‌یەکەیدا (سیکلوم)ە، زیاتریش وابێ دەچێ بەپیازی [...]ی (خۆرسك) گوترابێ .

سەبریش ئەوەیە لە نۆژداری عیراقی دێرین دا پیاز کەم بەکارهاتووە، ئەمەش لە سەرچاوە میخیە پزیشکیەکان دا دەردەکەوێ، تەنها بۆ هێندێ نەخۆشی نەبێ وەکو گوێ ئێشان و نەمانی ئاوی چاو.

**• سیر**

———: لە سۆمەری‌دا بە (se - shar) و لەبابلی و ئاشووری‌دا بە (شومو) هاتووە .

سیر لە عیراق دا زۆر زۆر کۆنەئەمەش بەووردی دەردەکەوێ کە لەنووسراوە میخیە زۆر کۆنەکان دا باسی هاتووە (سەرەتای هەزاری سێیەمی پ . ز) .

لە نۆژداری ئەوسایش دا سیر بۆ ددان ئێشان و میزگیران و هەروەها هەندێ لە نەخۆشی‌یەکانی زەرداو.

**• کولەکە (کدو)**

———: تێکستە میخیەکان باسی زۆر جۆری کولەکە دەکەن کە لە عیراقی کۆن دا چێنراون؛

هەر لە پۆلی خشۆکانیش ناوی ژاڵە بە کولەکەی کێوی هاتووە، کە جۆرێکیان سیفەتی (شاخاوی) بە دوادا هاتووەو بەدارشتەی سۆمەری بەم جۆرە هاتووە :

(ئوکشن - تی - جل - لا - کور - ڕا ) .

جۆرێکی دیکە بە سۆمەری بەدارشتەی (کور - ڕا Kur - ra) کە جۆری شاخاوی دەگمێنێ هاتووە .

* تری

———: تری بە سۆمەری (گیشتن ـ Geshtin) لەگەڵ وەپێشانی پۆلی درەختەکە.

لە بابلی و ئاشووریش دا (کرنو)یان پێ گوتووە، کە دیارە (کرم)ی عەرەبیش وەك مامۆستا طه باقر دەڵێ هەر لەوێوە هاتووە.

تری لە زۆر تێکستی مێخی دا باسی هاتووە هەر لە سەرتەمەکانی بەرایی‌وە (سەرەتای هەزاری سێیەمی پ.ز) کەوا پێ دەچێ زووتریش هەبووبێ. لێرەدا جێی باسە؛ هەر لەو وشانەی لەوشەی تریی سۆمەری‌دا هاتوون وشەی مێوژە ( Eshtin - Par - ) کە دەکاتە تریی وشکەوەبوو.

لەگەڵ وشەی (ئینو)یشدا یەك دەگرنەوە کە لێ ئوزەکان بە(مەی)یان لێك داوەتەوە.

لە نوژداری بابلی و ئاشووریشدا تری بەکارهێنراوە زیاتریش دۆشاوەکەی وەك نێوەندێك بۆ گرتنەوەی دەرمانی تر.

* هەنجیر

———: لە تێکستە مێخیەکان بەنیشانەی (ما ـ Ma) هاتووە (لەگەڵ پێشگری نیشانەی ناسینەوە).

هەر لە سەردەمی سۆمەریەکانیشەوە ناوی هەنجیر هەیە.

لە نوژداری کۆنیشدا بۆنەخۆشی‌یەکانی گەدەو بۆ ئاراوی بوون بەکارهێنراوە، هەروەها هەنجیر بە شیریش بۆبرین وژانە سەر لە سەرنراوە دوای ئەوەی سەرەکە پاك پاك تراشراوە.

* سێو

———: گوتمان هەنجیر بەنیشانەی میخی (ما ـ ma) هاتووە، جا ئەگەر هەندێ سەرەمیخی ئاسۆیمان بۆ زیادکرد بە (خاشخوو) دەخوێنرێتەوەو دەکاتە سێو.

تێکستەکانی (تل حرمل) حەفت چەشن سێوی تێدا هاتووە.

گۆرانیەکیش لەسەردەمی بابلی کۆنەوە هەیە تایبەتە بە خوداوەند (ماما) وتێیدا هاتووە دەڵێ: «گۆرانی ماما لە سێو شیرین ترە».

لەنوژداری کۆنیشدا بۆزۆر مەبەست بەکارهێنراوە، لەوانە لەگەڵ ئاوی شیرتێن بۆ پاك کردنەوەی دەم و هەروەها بۆنەخۆشی گەدەیش گوشراوەو ئاوەکەی دراوە بە نەخۆش.

لەهێندێ مەسەلەی پەیوەند بەجادوویش دا بەکارهێنراوە لەوانە (جادووی دڵداری)؛ بەوەی پیاو سێوێکی هێناوە وسێ جارانی بەسەردا خوێندووەو داویەتە ژن گوایە کە ژن خواردوویەتی بۆی هاتووەتە رایێ. پێ دەچی ئەمە هەر لە چیرۆکی باب ئادەم و داك حەواوە هاتبێ.

لەمانەو ناوی زۆر رووەك و بەرووبوومی دیکەش لە تێکستە میخیەکان دا هاتووە لەوانە قوخ و هەنارو هەرمێ‌و هی تر... (٥٧)

● ئەنجام ●

کشت و کاڵ بەهۆی ئەوەی کە دیارە سەرچاوەیەکی سەرەکی بژێوییە، ئێستاشی لەگەڵ دا بێ، چ جای سەردەمێك کە تازە لەدەمیزاد دەرکی پێ کردبێ و بایەخی زانیبێ و هاتبێ ماڵی کردبێ و وەناوی هێنابێ.

لەم روانگەیەوە؛ وەك لە بەراییشدا پەنجەمان بۆراکێشاوە کە نووسین دەربارەی باسێکی لەو چەشنە زۆرزۆری دەوێ، بەڵام ئێمە لەم باسەدا هەوڵمان داوە ئەو سەرەقەڵەمانەی بۆ بەشەکانمان هەڵبژاردووە بەپاڵپشتی چەندسەرچاوەیەکی باوەر پێ کراوەوە کەم تا کورتێك سنوورێکی بۆدیاری بکەین کە دەگونجێ هی تر بێن بەربڵاوتر یاهەر لە گۆشەنیگایەکی ترەوە باسی بکەن. بەهەرحاڵ ئەم باسە لە چەند سەرە قەڵەمێك

زیاتر نی یه لەو جیهانە فراوانەی ئەم بابەتە هەڵی دەگرێ.

## پەراوێز

(١) شایانی باسە کە کۆنترینی ئەو شوێنانەی لە عیراق دۆزراونەتەوە (بەردەبەڵکە)یە لە نزیك چەمچەماڵ، کە پاشماوەی چەرخی بەردینی دێرینی نزیکی لەوێ کە بە ئەشوولی ناسراوەی تێدا دۆزراوەتەوە - بڕوانە: فرج البصمچي - کنوز المتحف العراقي، بەڕێوەبەرایەتی گشتی ی شوێنەوارەکان، بەغدا ١٩٧٢، ل٤.

(٢) لەم بارەیەوە بڕوانە: د. محمد یوسف حسن، د. عمر حسن شریف، د. عدنان النقاش، (اساسیات علم الجیولوجیا) بلاوکردنەوەی - جۆن وایلی - نیویۆرك و شوێنی تر ١٩٨٢.

(٣) ناونانی ئەودەورانە بەناوی ئەورووپایی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە یەکەمین شوێنەوار بۆ یەکەم جار لەو جێیانە دۆزراوەتەوە.

(٤) پێش ئەو دەورەش، دەورێکی دیکە هەیە، لێتوێژەکان بە (چەرخی بەردینی ئایۆلیتی - Eolithic)ی دەناسن و کۆمەڵێك ئامرازی سادەی بۆ دەگەڕێنەوە کە پێی دەڵێن (چەنگڵە ئامراز - Pebble Tools) و لە باکووری ئەفەریقیا و شوێنی دیکە دۆزراونەتەوە. ئامرازی ئەم بابەتە لە عیراق نەدۆزراوەتەوە بۆیە دەمێنی لێرەدا باسمان نەکردووە، هەر لەم بارەیەوە هەندێ لە لێتوێژەکان ئەو ئامرازانە بەکردەی سروشت دەزانن لەوەی هی ئادەمیزاد.

(٥) بڕوانە: د. فرج البصمچي - کنوز المتحف العراقي - بەغدا - ١٩٧٢ ل١٤

(٦) طه باقر - مقدمة في تأریخ الحضارات القدیمة - ب١، دار البیان، ١٩٧٣ ل١٥٤.

(٧) دکتور تقي الدباغ، الثورة الزراعیة والقری الأولی زنجیرەی (حضارة العراق) بەشی یەکەم / دار الحریة بغداد ١٩٨٥ ل١١٤

(٨) هەر ئەو سەرچاوەیە.

(٩) دکتور هاری ساکز، عظمة بابل - وەرگێڕانی: د. عامر سلیمان بەغدا / ١٩٧٩ ل٢٦.

(١٠) هەر ئەو سەرچاوەیە.

(١١) نموونەی هەموو ئەو ئامرازانە لە مۆزەخانەی عیراقی دا لە بەغدا پارێزراون.

(١٢) دکتور تقي الدباغ، الثورة الزراعیة والقری الاولی، زنجیرەی (حضارة العراق) - بەشی یەکەم - بەغدا ١٩٨٥ ل١٢٠.

(١٣) ساڵی ١٩٨٦ - ١٩٨٧ تیپەدیەکی پۆلۆنی هەوارگەیێکی دیکەی لەنزیك شاری دهۆك (کوردستانی عیراق) دۆزیەوە هەرچەندە تا ئێستا شتێکی لەوتۆیان لەبارەی ئەم هەوارگەیە بلاونەکردووەتەوە. بەلام وەك ڕاگەیاندنی سەرەتایی بە هەوارگەیێکی کۆنتر لە (چەرمۆ) یان ژماردوە.

(١٤) ڕێگای (کاربۆن ١٤) دەمێکە لە توێژینەوەی یەکەوتنی مێژوویی پاشماوە ئەرینەکان و زانینی تەمەنیان دا بەکاردێ بەتایبەتی بۆ ماددە ئۆرگانییەکان.

ئەم ڕێگایە بەهۆی تیشکی کاربۆنییەوە کە لەو ماددانەدا دەمێنێتەوە تەمەنیان دەستنیشان دەکەن، بەوەی ئەم جۆرە کاربۆنە دەچێتە نێو ڕووەك و لەشی گیانەوەر، گەردیلەکانی کاربۆن ١٤ لە ماوەی تێپەڕبوونی ٥٥٦٨ + ٣٠ ساڵ دا نیوەی دەبرا، دوای تێپەڕینی هەمان وەخت ئەو نیوەیەی کە ماوە، نیوەی لەدەست دەدا و بەم جۆرە..

(١٥) دکتور هاری ساکز، عظمة بابل - ل٢٩.

(١٦) دکتور تقي الدباغ، الثورة الزراعیة والقری الاولی، زنجیرەی (حضارة العراق) ب١ ١٩٨٥ ل١٢٤.

(١٧) هەر ئەو سەرچاوەیە ل١٢٥.

(١٨) بڕوانە - ول دیورانت، قصة الحضارة - وەرگێڕانی محمد بدران ب٢ - قاهیرە ١٩٦٥ ل٥.

(١٩) طه باقر، مقدمة في تاریخ الحضارات القدیمة - ب١ - ١٩٧٣ ل٢٩.

(٢٠) هەر ئەو سەرچاوەیە ل٢٦.

(٢١) لێرەدا جێی باسە کە بڵێین ئەو پرۆژەیەی سەنحاریب پرۆژەیەکی تایبەت بە کۆشك و تەلاری خۆی بووە!

(٢٢) علی محمد مهدي، (النشاط الملکیة الزراعیة في وادي الرافدین)، گۆڤاری (النفط والتنمیة)ی بەغدای ژمارە (٧و٨)ی یێکەوە ١٩٨١ ل١٩٩.

(٢٣) بڕوانە: فرج البصمچي، کنوز المتحف العراقي، شایانی باسە ئێستاش لەگەڵەدا پێ ئەم جۆرە ئامێرانە لەنێو دیهاتنشینەکانی کوردا بەکاردێن.

(٢٤) دکتور فوزي رشید، صناعة الطابوق في العراق القدیم - گۆڤاری (النفط والتنمیة) ژمارە ٧و٨ی پێکەوە ١٩٨١ ل٤٤.

(٢٥) شایانی باسە کە یەکەمین مۆری لوولەیی (پارچە بەردێکی لاکێشە بووە) لەچینی دووەمی شوێنەواری حەسوونەی باکووری عیراق دۆزراوەتەوە و بۆ ٥٤٠٠ی پ. ز دەگەڕێتەوە - بڕوانە دکتور عادل ناجي - الاختام الاسطوانیة - زنجیرەی (حضارة العراق) ب٤ - دار الحریة - بەغدا ١٩٨٥ ل٢٢.

(٢٦) دکتور هاری ساکز - عظمة بابل - ل٢٩

(٢٧) ئاندری پارو - بلاد آشور، نینوی و بابل - وەرگێڕانی: د. عیسی سلمان و سلیم طه التکریتي - دار الرشید - بەغدا ١٩٨٠ ل٦٧.

(٢٨) دکتور احمد سوسە، تاریخ حضارة وادي الرافدین، ب١ - دار الحریة - بەغدا ١٩٨٣ ل٤٤٨.

(٢٩) صموئیل نوح کرایمر، من الواح سومر، وەرگێڕانی طه باقر و احمد فخري - مؤسسة فرنکلین قاهیرە ص١٩.

(٣٠) بۆیە پێی گوتراوە ئەکادیما، چونکە پەیمزاران تابلێتی لە هەموو لایەنێکی زانستەوە لێ دۆزراوەتەوە.

(٣١) دکتور فاضل عبدالواحد علي، الراعي والفلاح في الادب السومري وقصة هابیل وقابیل في التوراة - گۆڤاری (بین النهرین) ژمارە ٣٢ ساڵی هەشتەم

بەغدا ١٩٨٠ ل٣٦١.

(٣٢) لە عیراقی کۆن دا باوەڕی باو ئەوەبوو کە خوداوەند ساڵی جارێك چارەنووسی فەرمانڕەواو گەل دیاری دەکا، بۆیە پێویست بوو کەپاشا لەو ئاهەنگەدا بڕیاری خوداوەندی بۆبەرێ و نیشانەی فەرمانڕەوایی بەرێتی بۆ ساڵێکی تر لەپێناوی ئەوەیدا کە کشت و کاڵ بێبگاو بەرهەم زۆر بێ ڕووبارەکان سەربکەن و ترێو هەنگوین زۆر بێ و.. تاد.

(٣٣) طه باقر، د. فاضل عبدالواحد علي، عامر سليمان (تاريخ العراق القديم) ب٢ بغدا ١٩٨٠ ل٣٧.

(٣٤) طه باقر، مقدمة في أدب العراق القديم - بغدا ١٩٧٦ ل١٦٤.

(٣٥) هەر لەو سەرچاوەیە ل١٥٨.

(٣٦) طه باقر - دراسة في النباتات المذكورة في المصادر المسمارية - گۆڤاری سومر جزمی هەشتەم - بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوارەکان ١٩٥٢ ل٤.

(٣٧) هەر لەو سەرچاوەیە.

(٣٨) هەر ئەو سەرچاوەیە ل٦.

(٣٩) د. فوزي رشيد، الشرائع العراقية القديمة - بغدا ١٩٨٧ [illegible] ل١١.

(٤٠) سێ نوسخەی لەو تێکستە میخیە نووسراوانە بە زمانی [illegible] دۆزراونەتەوە کە باسی لەو چاکسازیانەی تێدایە لەگەڵ باسی باری نالەباری ئەوسای وڵاتی سۆمر پێش دەرچوونی لەو چاکسازیانە.

(٤١) چونکە ئاشووریەکان هەموو هێزێکیان دابووە ئەوەی دەستکەوتە سەربازییەکانیان تۆمار بکەن لەگەڵ هەندێ لەو دەستکەوتانەی پێوەندی بە ئاوەدان کردنەوەو بیناسازییەوە هەیە. بۆیە ئەوەندەیان بەروە دانانی یاساوە نەبوو.

(٤٢) چونکە دەبووایە دروێنە لە وەختی خۆی دا تەواو کرابووایە.

(٤٣) بۆ دەقی لەو رێککەوتنە بڕوانە: د. عامر سليمان، القانون في العراق القديم ل١١٩.

(٤٤) د. فەوزی رشید، الشرائع العراقية القديمة - بەغدا ١٩٨٧ چ٢ ل٢١.

(٤٥) جێی باسە کە ئەو چاکسازیانە لە کەلاوەی شاری (لەگەش)دا لەلایەن تیردەیەکی فەرەنسییەوە دۆزرانەوە - بڕوانە. فوزی رشید، الشرائع العراقية القديمة.

(٤٦) هەر ئەو سەرچاوەیە ل٣٢

(٤٧) هەر ئەو سەرچاوەیە.

(٤٨) طه باقر، قانون لبت عشتار، قانون مملكة اشنونا - بەغدا ١٩٨٧ ل٢٥.

(٤٩) هەمان سەرچاوە ل٢٠.

(٥٠) هەمان سەرچاوە ل٢٣.

(٥١) هەمان سەرچاوە ل٤٩.

(٥٢) لەدەقێنانەوەو وەرگێڕانی دەقەکان دا پشتمان بە وەرگێڕانەکەی مامۆستا محمود الامين بەستووە کە لە گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیاتی دانشگای بەغدا - ژمارە ٣ی ساڵی ١٩٦١ بڵاوکراوەتەوەو پاشانیش لەلایەن دەزگای کاروباری رۆشنبیری لە بەغدا چاپ کراوەتەوە. بڕوانە: (د. محمود الأمين - قوانين حمورابي صفحة رائعة من حضارة وادي الرافدين - بەغدا ١٩٨٧).

(٥٣) بڕوانە: برهان محمد نوري - تجارة العراق الخارجية - گۆڤاری النفط والتنمية - ژمارە ٧و٨ی پێکەوە - دار الثورة - بغدا ١٩٨١ ل١٦١.

(٥٤) طه باقر، دراسة في النباتات المذكورة في المصادر المسمارية - گۆڤاری سومر - جزمی ٨ - ١٩٥٢ ل٣١.

(٥٥) هەر ئەو سەر چاوەل٣٢.

(٥٦) هەر ئەو سەرچاوەیە ل٣٦.

(٥٧) هەر ئەو سەرچاوەیە ل١٨٠.

## سەرچاوەکان:


• طه باقر، مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة - بەشی یەکەم - ج١ دار البيان بەغدا ١٩٧٣.

• صباح عبود جاسم - مرحلة الانتقال من جمع القوت في العراق وجنوب غرب آسيا - نامەیەکی ماستەر - بڵاونەکراوەتەوە - بەغدا ١٩٧٥.

• دکتۆر تقي الدباغ - الثورة الزراعية والقرى الاولى - زنجیرەی (حضارة العراق) ب١ دار الحرية - بغدا - ١٩٨٥.

• دکتۆر تقي الدباغ البيئة الطبيعية والانسان - هەمان زنجیرەی سەرەوە.

• لیو ئوپنهایم - بلاد مابين النهرين - وەرگێڕانی: سعدي فيضي عبدالرزاق، وەزارەتی راگەیاندن - بەغدا ١٩٨١.

• د. فرج البصمجي - كنوز المتحف العراقي - بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوارەکان بەغدا ١٩٧٢.

• هاری ساکز - عظمة بابل - وەرگێڕانی دکتۆر عامر سليمان - بەغدا ١٩٧٩.

• ول دیورانت - قصة الحضارة - وەرگێڕانی د. زكي نجيب محمود - ب١ - جزمی یەکەم - قاهیرە - ١٩٦٥.

• طه باقر، د. فاضل عبدالواحد علي، د. عامر سليمان - تاريخ العراق القديم - ب١ و ب٢ چاپخانەی زانکۆی بەغدا/ ١٩٨٠.

• رضا جواد الهاشمي - دور نهر الفرات في الامتدادات الحضارية لبلاد وادي الرافدين - گۆڤاری - بين النهرين ژمارە ١٤/١٩٨٣.

• د. احمد سوسە، تاريخ حضارة وادي الرافدين في ضوء مشاريع الري - ب١ - دار الحرية - بغدا ١٩٨٣.

• علي محمد مهدي، انماط الملكية الزراعية في وادي الرافدين گۆڤاری - النفط والتنمية ژمارە ٧و٨ی پێکەوە - بغدا ١٩٨١.

• غسان طه یاسین، العصر الحجري القديم الأوسط في الشرق الادنى - نامەی ماستەر - بڵاونەکراوەتەوە - نیسانی ١٩٧٦.

• صموئيل نوح کرایمر - من الواح سومر - وەرگێڕانی طه باقر و د. احمد فخري.

دەزگای فرنکلین ـ قاهیره.

- صەموئیل نوح کرایمەر ـ السومریون، تاریخهم وحضارتهم وخصائصهم، وەرگیرانی د. فیصل الوائلي ـ وكالة المطبوعات ـ الكويت.
- دکتۆر (عادل ناجي، الاختام الأسطوانية ـ زنجیرەی (حضارة العراق) بەشی چوارەم ـ دار الحرية ـ بەغدا ١٩٨٥.
- د. تقي الدباغ و د. وليد الجادر واحمد مالك الفتيان ـ طرق التنقيبات الأثرية ـ بەغدا ١٩٨٣.
- د. تقي الدباغ، مقدمة في علم الآثار ـ زنجیرەی ـ الموسوعة الصغيرة ـ ژمارە ٨٨ ـ دار الجاحظ، بەغدا ١٩٨١.
- ئاندری پارۆ، بلاد آشور، نينوى وبابل ـ وەرگیرانی: د. عيسى سلمان وسليم طه التكريتي ـ دار الرشيد ـ بەغدا ١٩٨٠.
- طه باقر و د. عبدالعزيز حميد، طرق البحث العلمي في التاريخ والآثار ـ وەزارەتی فێرکردنی بالا ـ بەغدا ١٩٨٠.
- طه باقر، دراسة في النباتات المذكورة في المصادر المسمارية گۆڤاری سومر، جلدی ٨ بەشی (١) بەرێوەبەرایەتی شوێنەوارەکان بەغدا ١٩٥٢.
- د. فوزي رشيد ـ الشرائع العراقية القديمة ـ ج٢ بەغدا ١٩٨٧.

- H.FRANKFORT, The Birth of Civilization in the Near East, 1956.
- Jonathan Norton, The First Farmer

چاپی ئەمەریکا.


ملخص البحث

# الزراعة في العراق القديم

بژاد عزيز سورمی

کل المؤرخين وباحثي الآثار لم يختلفوا في إعتبار بلاد مابين النهرين مهد الحضارات، حيث ان الانسان قد عاش منذ زمن سحيق في هذه الرقعة لما فيها من جبال منيعة وأنهار وافرة ووديان خصبة.

يتناول هذا البحث الزراعة من جانب إنها كانت عماد الحضارة والحياة مثلما هي الآن عماد الحياة.. وفي اساسه فان البحث قدم في حينه الى رئاسة قسم الآثار في كلية الآداب جامعة بغداد كجزء من متطلبات التخرج ولايخفي ان موضوعاً بهذه الأهمية قد طرح على بساط البحث في عدد من الدراسات التي لها علاقة بحضارة وادي الرافدين وهذا مادفعني (ولا سيما إنه كان من اختيار رئاسة القسم) تناول البحث في مفرداته الغير المتناولة والاسهاب فيما تناولتها تلكم البحوث في هذه المفردات دون إسهاب..

وهكذا إستقر البحث على أربعة فصول إضافة الى المدخل وخلاصة تأريخية حول الموضوع وكما يلي:

المقدمة: وهي بمثابة مفتاح لدخول الموضوع تطرقت فيها باقتضاب الى التسلسل التأريخي لعصور ماقبل التأريخ والعصور الحجرية مع التوقف عند الفترة التي ظهرت فيها الزراعة والمعروفة بالعصر الحجري الحديث حيث بداية الاستيطان ومن ثم ظهور القرى الزراعية الاولى.

الفصل الاول: تناولت فيه عوامل قيام الزراعة في العراق منذ القدم

الفصل الثاني: وهذا الفصل خصصته لمصادر دراسة الزراعة في العراق القديم، وقد عرضت فيه ابرز هذه المصادر المادية منها والمدونة.

الفصل الثالث: تناولت التنظيمات والقوانين المتعلقة بالزراعة وعرضت في هذا الفصل دور المعبد كمؤسسة دينية ودنيوية في الحياة الاقتصادية والاجتماعية في العراق قديماً، اضافة الى الرسائل والعقود المتعلقة بتنظيم شؤون الزراعة المبرمة آنذاك.

أما الفصل الرابع والاخير: فكان لأبرز النباتات والمزروعات في العراق القديم واستعمالاتها الطبية.

ثم أتبعته بقائمة الهوامش، حيث وضحت فيها ما يستوجب التوضيح من النص لقائمة المصادر التي استفدت منها بشكل أو بآخر في الكتابة...



# خوالێخۆشبو مامۆستا ئیسماعیل رەسول

ساڵی ١٩٢٨ رۆڵەی خێزانێکی رەنجدەر ئیسماعیل رەسوول لە حەمدەماتە دنیاوەو لەگەڵ باوکی کە لە فەرمانبەرێتی پولیس بوو چەند شارێك گەراو خوێندن لە رەواندوزو کۆیەو هەولێر تا دوا پلەی ئامادەیی خوێند، ساڵی ١٩٤٨ قوتابیەکی زیرەکی پۆلی پێنجی ئامادەیی بوو، ئەندامێکی چالاکی بەرەی سیاسی دەستەچەپو بزوتنەوەی نیشتمانی بوو، هەرکە باری سیاسی ئاڵۆز بوو بە دەستی بە کەلەپچەوە بەرەو بەندیخانە بەرێ کەوت، چەند ساڵێك بە تاوانی چالاکی سیاسیو بەشداریی لە خۆپیشاندانەکانی دژی پەیمانی پورتسموثو سەردەمی پاشایەتیدا حەپس کرا. پاش بەندیخانەش دوو ساڵ لە ژێر چاودێریی پۆلیسو بەرەنجی شانو موورچەی کارگەریو حیسابگری لای بازرگانو شەریکەو هەندێ دەزگا لە بەغدا ژیان بردەسەر. لە بەندیخانە حیسابگرتنی شێوەی تازەو بەلاتجوو نامەبەریی ئینگلیزی فێر بوو. پاشان ساڵی ١٩٥٦ جارێکی تر گیرایەوەو رەوانەی ئۆردووگای دوورخستنەوەی (بەدرە) کرا تا شۆرشی چواردەی تەمووزی ١٩٥٨ لەوێ دامایەوە..

پاش ئازادبوونی توانی جارێکی دی لە خوێندن هەڵچێتەوەو ئامادەیی پاشان کۆلیجی زمان بەشی زمانی ئینگلیزی تەواو بکات. بە کۆششی خۆیشی فێری زمانی رووسی بوو. ساڵی ١٩٥٩ لە وەزارەتی چاککردنی کشتوکاڵ لە بەشی حیسابات دا دامەزرا، ساڵی ١٩٧٤ بوو بە ئەندامی یەکەم ئەنجومەنی یاسادانانی ئۆتۆنۆمیی کوردستان لە هەولێر، پاشان بوو بە سکرتێری ئەنجومەن. دوای تەواوبوونی خولی ئەنجومەنەکە بوو بە پارێزگاری هەولێر، ئەنجا راوێژکار لە وەزارەتی رۆشنبیریو راگەیاندن دواجار بوو بە بەڕێوەبەری گشتی دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی.

ئیسماعیل رەسوول لە شەستەکاندا ئەندامی یەکێتی ئەدیبانی عیراق بوو، ساڵی ١٩٧٣ش بە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتیی نووسەرانی کورد هەڵبژێردرا.

لە سەردەمی لاوییەوە خەریکی خوێندنەوەی ئەدەبو رۆشنبیریی سیاسی بوو، لە قوتابخانەی ناوەندی کۆیە هەوڵی دا بە کوردی هەڵبەست بنووسێ، پاشان بە هۆی زاڵبوونی زمان و رۆشنبیریی عەرەبی بەسەر خوێندنەوەکەیدا ـ لە ساڵانی پەنجاکان دا ـ وتارو کورتە چیرۆکی بابەتی کوردانەی بە زمانی عەرەبی دەنووسی و بڵاوی دەکردەوە، تا دوای ساڵانی حەفتا، ترسی لە کوردی نووسین شکاندو کۆمەڵێ وتاری سیاسی و ئەدەبی بە کوردی نووسی وەلی دا وەرگێرانی چیرۆکە عەرەبی زمانەکانی خۆی بە کوردی، دوایی یەکسەر چیرۆك و وتار لە نجار رۆمان بە کوردی نووسی. بە عەرەبی لە رۆژنامەگەلی بیروت المساء، البلاد، الاهالی، النور، التآخی، گۆڤاری آفاق عربیە، الادیب العراقی و بە کوردیش لە نووسەری کورد، دەفتەری کوردەواری، رۆشنبیری نوێ، بەیان، هاوکاری ولوتونومی دا وتارو چیرۆکی بڵاو کردوەتەوە.

ناوەرۆکی بەرهەمەکانی هەمووی بیروباوەڕی مرۆڤایەتیو گەلدۆستیو نیشتمانپەروەری یە. وتارو لێکۆڵینەوەکانی بابەتی و زانستانەو پوختەن وئاستی رۆشنبیری و بیرکردنەوەی شیاوی دەنوێنن. بەرهەمە چاپکراوەکانی ئەمانەن:

١ـ ضوء علی الجذور التاریخیة لثورة ١٤ تموز ـ بغداد/ ١٩٥٩.
٢ـ چەند باسێك دەربارەی ئەدەب و رەخنەی ئەدەبی بەغدا ـ ١٩٨١
٣ـ تەلەزگە ـ کۆمەڵێ کورتە چیرۆك بەغدا ١٩٨٨.
٤ـ پەرستگەی دڵداری ـ رۆمان ـ بەغدا ـ ١٩٩٠.

لە رۆژی ١٩٩١/٦/٧ لە بەغدا کۆچی ماڵاوایی کرد، دوای ئەوەی ماوەیەك بە نەخۆشی یەکی بێ ئەمان ئازاری کێشا.

ع. پیمر






گۆڤارێکی مانگانە بووە بە زمانی کوردیو تورکی بلاو کراوەتەوە یەکەمین ژمارەی لە ١٩١٣/٦/١٩ لە ئەسطنبول دەرچووە سێ ژمارەی لێ دەرچووە هەر سێ ژمارەکە بەیەك قەوارەی (٢٤سم×١٥سم) دەرچووە لەسەر هەر سێ ژمارەکە نووسراوە صاحب امتیاز و مدیر مسؤول عبدالکریم ئەفەندی تاریخ تاسیس ١٣٣١ دەکاتە ساڵی ١٩١٣ ژمارەیەکی بە وێنەی سەلاحەدین ئەیوبیو ژمارە دووی بە وێنەی کەریم خانی زەند وژمارە سێ بە وێنەی حوسێن کەنعان پاشای بەدرخان ڕازاوەتەوە ژمارەیەکی لە چاپخانەی (حقوق)و ژمارە دووی لە چاپخانەی (اجتهاد)و ژمارە سێی لەچاپخانەی محمود بەگ چاپکراوە، نووسەرانی هەر سێ ژمارەکە ئەم بەڕێزانە بوون، دیارە زوربەی نووسینەکان ناوی نهێنیو یاخود بێ ناو بڵاوکراونەتەوە: د. عەبدوڵلاجەودەت ئەجەدینی کەرکوکیح. ب، خەربووتیخ فەخری، مەدحەت، مەسعوودی سلیمانی، عەبدولکەریم، نەجدەت، فوئاد تەمو، نالی ئیسماعیل حەقی بابان زادە، م. ساڵح بەدرخان، م. ص، ئازیزی، حاجی قادری کۆیی، شێخ ڕەزاتاڵەبانی، ئەحمەدی خانیو گندو..

ڕوشنبیری نوێ

ROSHAN BEERY NWE
PUBLISHED BY THE KURDISH
CULTURAL AND PUBLISHING HOUSE
MINISTRY OF CULTURE AND
INFORMATION BAGH DAD-IRAQ



مجلة رۆشنبیری نوێ
تصدر عن دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والاعلام بغداد

خوالێخۆشبوو ئەدیب و نووسەری کورد محمد سعید جاف، لە
ڕۆژی ١٢/٤/١٩٢٦ لە کەلار چاوی بەدونیاهەڵهێناوەو لە
٢٤/٣/١٩٩٦ دوامالئاوایی لێ کردین..

لوحة الغلاف الاول : تكوين الفنان ليث متي

السعر ٢٥ دينار

دار الحرية للطباعة